# قورئان و سوننەت

## وەك

## ڕووح و جەستەی تێکهەڵکێش







2022 - 1443

عەلی باپیر

**قورئـان و سوننەت وەك ڕووح و جەستە تێكهەڵكێشن**

**نووسین: عـــەلی بـــاپیر**



چاپی یەکەم ١٤٤٣ز - ٢٠٢٢ك






**نوسینگەی تەفسیر**
بـۆ بڵاوکـردنـەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
عـەلی بـاپیر (نووسەر)
قورئان و سوننەت وەك ڕووح و جەستە تێكهەڵكێشن
٩٩ لاپــەڕە
١٤ * ٢١ سـم
بابـەت : ئایینی
ISBN : 978-9922-654-84-3
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (٢٧٣٢) ی ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خـەتی بـەرگ :** نـــەوزاد کۆیــی
**دیزاینی ناوەوە :** زەردەشت کاوانی

# قورئان و سوننەت

# وەك ڕووح و جەستە

# تێکهەڵکێشن



نووسینی

**عـــەلی بـــاپیر**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم
مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ
أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ النساء.

## پێشکەش بێ

بەهەموو ئەوانەی دەزانن ئیسلام وەك بەرنامەی تێرو تەواوی خوا، لەقورئاندا بەرجەستەیەو، ڕوونکردنەوەی قورئانیش «لەلایەنە کردەییەکەی و جێبەجێکردنی دا»، لەڕێبازی پێغەمبەری خوا (محمد) «صلى الله عليه وسلم»دا نمایانە.

## پێشەكی و ڕێخشكردن

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد: فَإِنّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحَمَّد صَلَّى اللَّه عَليهِ وَسلَم، وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلَّ بِدْعةٍ ضَلالة.

خوێنـــەری بەڕێــز !

مامەڵەی مسوڵمانان بەگشتیی و زاناو پێشەوایانی ئیسلام بەتایبەت، لەگەڵ فەرمایشتی خوا (قورئان)و ڕێبازی پێغەمبەر (سنة النبيِّ)دا، قۆناغی جۆراو جۆرو هەورازو نشێوی زۆری بە خۆوە دیون و، پێم وایە بە سەرنجدانی وردی بابەتییانەی دوور لە کارتێکراویی بە بەرهەم و کەلەپووری زانایان لە هەموو بوارەکاندا، بۆمان دەردەکەوێ کە زاناو پێشەوایان، هەتا لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا «صلی الله علیه وسلم» نیزیکترو، بەمیتۆدی پێشین (منهج السلف) ەوە پابەند تربوون، ئەو ڕاستییەیان لەلا درەوشاوەتر بووە کە ئیسلام وەك بەرنامە، یەکسان بووە بە قورئان و، ڕێبازی پێغەمبەر (سنة النبيِّ)یش بریتی بووە لە چۆنیەتی پراکتیزەو جێ بەجێکردنی قورئان و ڕوونکردنەوەی، لە ڕووە کردەییەکەیەوە.

بەڵام دوایی وردە وردە لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەی مسوڵمانان بەگشتیی و بەشێك لە زانایان بەتایبەت، لە قووڵ و فراوان تێگەیشتنی قورئان و، لەسەر حیسابی قورئان، تێپەڕاندن لەسەر گەرم بوون بە سوننەتدا، بێ خەبەر لەوە کە بەهۆی سوننەتەوە هەرگیز تێگەیشتنێکی ڕاست و قووڵ و هاوسەنگمان لەبارەی ئیسلامەوە دەستگیر نابێ، چونکە ئەوە ئەرکی سوننەت (ڕێبازی پێغەمبەر) نیەو، ئەوە تەنیا ئەرکی قورئانەو، ڕێباز (سنة) ئەرکەکەی ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی جێبەجێکردنی قورئانە لە ڕووە کردەییەکەیەوە، وەك: ئەنجامدانی دروشمەکانی خوا پەرستیی (شعائر التعبد)و، سەرجەم هەڵس و کەوتە دینداریی و دنیا دارییەکانی دیکە.

دواتریش لە لایەن زۆرێك لە زانایانەوە، ئەو حاڵەتی جێ پێ لێژکردنی قورئان تەبەننیی کراو، زێدەڕۆیی تێداکرا، تاکو سوننەت هێنرایە ئاستی قورئان و، بگرە هەندێکیان ڕێباز (سنة)یان هێنایە سەرەوەی قورئانیش و گوتیان: (السنة قاضية على القرآن) ڕێباز بڕیار بەسەر قورئاندا دەدات!!

دواتریش لە چاخەکانی دیکەدا، هەندێك لە زانایان وێڕای قورئان، سوننەتیشیان هەڵبوارد، بە بیانووی ڕێزلێگرتنی بیروڕاو ئیجتیهاد و تێگەیشتنی پێشەوایانیانەوەو، هی وایان هەبوو گوتی: هەر ئایەتێك و دەقێکی سوننەت، لەگەڵ بیروڕاو فەتوایەکی فڵان ئیمامەدا تێك بگیرێ، پێویستە تەئویل بکرێ!!

گومانیشی تێدا نیە، بۆ تێگەیشتنی ڕاست و دروست لە ئیسلام و، مامەڵەی تێروتەواو و پڕ بە پێست لەگەڵ فەرمایشتی خوا (قورئان) و ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەری پێشەواداو، دواتریش تێگەیشتی بەرهەم و کەلەپووری زانایان، پێویستە هەرکامیان وەك خۆی بناسین و، ڕیزبەندیی (ترتیب) ئاسایی و سرووشتییان بە وردیی ڕەچاو بکەین و، هەرکامیشیان بەئەندازەی پێگەو شایستەیی خۆی گرنگیی و بایەخی پێبدەین.

شایانی باسیشە:

ئامانجی بنەڕەتیی لە ئامادە کردنی ئەم بەرهەمەدا «سەرەتا بەوتارو پاشان بە کتێب» بریتیە لە ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتەو تیشك خستنە سەری.

پێویستیشە بگوترێ: کە ئەم بەرهەمە لە ئەسڵدا وتارێکی بەندەیە، کە بە هەمان ناو ونیشان لە کۆڕێکدا لە شارۆچکەی: (حاجیاوا) پێشکشکراوە.

ئەم بەرهەمەش لە پێنج تەوەر پێكهاتوە:

١ـ پێناسەو ئامانجی ئەم بابەتە.

٢ـ پێناسەی قورئان و سوننەت.

٣ـ بەبێ قورئان نازانین ئیسلام چییەو، بەبێ ڕێباز (سنة)یش نازانین چۆن قورئان جێ بەجێ دەكرێ.

٤ـ ئیمتیازەكانی قورئان بەسەر سوننەتدا.

٥ـ ڕوونكردنەوەی چەمكی كەمتەرخەمیی و زێدەڕۆیی، لە بواری مامەڵە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا.

هیواداریشم ئەم بابەتە كەلێنێكی باش بگرێ و، ئەو ئامانجەی بۆی ڕەچاوكراوە، بەباشترین شێوە بهێنێـتەدی و، خواش بە كەرەمی خۆی عەقڵ و دڵی هەمووانمان هێندە فراوان بكات، بتوانین جێی هەر بیرۆكەو بۆچوونێكی تازەی پشت ئەستوور بە بەڵگەی سەلمێنەر لە خۆماندا بكەینەوە، هەرچەندە یەكەمین جاریش بێ لێی ئاگادار دەبین و، هەرگیز وانەبین پێمان وابێ: هەرچی ڕاستیی و حەق هەیە، پێشین هەموویان لە قورئان و سوننەت دەرهێناوەو، هیچیان بۆ ئێمەومانانی پاشین تێدا نەماوە، چونكە بێگومان شەریعەتی ئیسلام بۆ تێكڕای جندو مرۆڤ و، سەرجەم چاخ و ڕۆژگارەكان نێرراوە!

١٢/ڕەبیعی یەكەم/١٤٤٣ك - ٢٠٢١/١٠/١٨ز

هەولێر

## دەستپێك

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

بەخێرهاتنی هەموولایەك دەکەم و خۆشحاڵم لەم ئێوارەکۆڕەدا بەدیدارتان شاد دەبم، ئەو بابەتەی پێشکەشتان دەکەم تاڕاددەیەك بابەتێکی فیکریی و ئیمانییە و، پێویستیی بە ڕامان و وردبوونەوەی باش دەکات، تاکو ئەوەی دەمەوێ و مەبەستمە، وەك خۆی لێمتێبگەن و، ئەم بابەتەش بابەتێکە پەیوەندیی بە هەموو مسوڵمانێکەوە هەیە.

بەڕێزان!

ئایین وبەرنامەکەی ئێمە کە ئیسلامە، دوو سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی هەن، کە لێیانەوە هەڵدەقوڵێ، ئەوانیش:

یەکەم: قورئان کە فەرمایشتی خوایە.

دووەم: سوننەت کە ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوایە (صلی الله علیه وسلم).

بابەتەکەم بەم ناوونیشانەیە:

(قورئان و سوننەت وەك ڕووح و جەستە تێکهەڵکێشن).

کۆی ئەم بابەتەش لە پێنج تەوەردا دەخەینەڕوو، سەرەتاش دەمەوێ لە تەوەری یەکەم دا پێناسەی ئەم ناوونیشانەتان بۆ بکەم و، ئامانج لە هەڵبژاردنی بخەمەڕوو:




## پێناسە و ئامانجی ئەم بابەتە

**أ- پێناسە: قورئـان وەك ڕووحە بۆ سوننەت:**

بەڕێزان!

وەك چۆن مرۆڤ لەدوو پێکهاتەی سەرەکیی دروستبووە: ڕووح وجەستە، ڕووحەکە دروستکراوێکی تایبەتیی خوایەو لە سەرووی ماددەوەیە، جەستەکەش هەر لەو ماددانە پێکدێت کە لەزەویدا هەن، ئینسانیش بەڕووح وجەستە بۆتە ئینسان، بەهەمان شێوە ئیسلامیش بە قورئان و سوننەت، بۆتە ئایین وبەرنامەیەك کە ئیمە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی خۆمانی پێ بەڕێوە بەرین و، لەسەر ڕێك بخەین، ئنجا وەك چۆن ڕووح و جەستە تێکهەڵکێشن، قورئان و سوننەتیش هەروان، هەڵبەتە ڕووح بەبێ جەستە دەبێ، بەڵام دیارنیە و ناتوانین مامەڵەی لەگەڵ دا بکەین، بەڵام بەتەئکید جەستە بەبێ ڕووح نابێ، جەستە بەبێ ڕووح کە لەشێکی مردوویەو، خەڵك لێی بەپەلەیە تاکو دەیخاتە ژێر خاك، ئەگەرنا ئەو جەستەیە دوای ئەوەی ڕووح بەجێی دێڵێ، شی دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو توخمانەی لێیان دروست بووە.

پێنج جۆرە پێکچوون لەنێوان ڕووح و جەستەو، قورئان وسوننەت دا:

یـــەك: قورئان پێکهاتەی بنەڕەتیی ئیسلامە، کە وەحیی ڕووت وساغی خوایە، پێکهاتەی دووەمی ئیسلامیش سوننەتە، کە ئەویش هەوێن و هەناوەکەی هەر قورئانە.

هەڵبەتە من لەزمانی کوردییدا پێم باشترە لەجیاتی سوننەت، ڕێبازی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) بەکاربهێنرێ، کە دوایی حیکمەتەکەیتان بۆ ڕوون دەکەمەوە، چونکە کە دەگوترێ: سوننەت، خەڵکێك بەهەڵە لەم چەمك و وشەیە تێدەگات، کە لە ڕاستییدا سوننەت مانا زمانەوانییەکەی مەبەستە، واتە: (ڕێباز و ڕێگا) وەك دوایی لە پێناسەکەیدا باسی دەکەین.

ئیسلامیش بریتیە لە قورئان کە وەك ڕووحەکە وایە، ئنجا بریتیە لە ڕێبازی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) کە وەك جەستەکە وایە، ئیسلامیش بەبێ قورئان، هەر بوونی نابێ، بەبێ سوننەتیش بەڵێ قورئان هەیە، بەڵام نازانین چۆن مامەڵە لەگەڵ قورئاندا بکەین لەڕووە کردەییەکەیەوە، ئێمە بەهۆی سوننەت، بەهۆی ڕێبازی پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) دەزانین قورئان چۆن جێبەجێ بکەین و، چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟!

دوو: قورئان پەنهانە بەڵام ڕێبازی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئاشکرایەو بەرجەستە کراوە، هەرووەك ڕووحی مرۆڤیش پەنهانە، بەڵام جەستەکەی دیارو ئاشکرایە.

ســـێ: قوڕئان بەبێ سوننەت دەگونجێ هەبێ، بەڵام دیارە ڕێباز (سنة) بەبێ قوڕئان نابێ.

ڕێباز (سنة) هەر بریتیە لە پڕاکتیزەکردنی قوڕئان، ئنجا ئەگەر قوڕئانێك نەبێ، ڕێبازێك وەك ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوونی وێنا (تصوّر) ناکرێ، بەهەمان شێوەش ڕووح دەگونجێ هەبێت بەبێ جەستە، بەڵام جەستە بەبێ ڕووح نابێ:

﴿...وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي...﴿٧٢﴾﴾ ص، دەبێ جەستەکە هەبێ و ڕووحی بەبەر دابکرێ، کاتێکیش ڕووح جەستە بەجێ دێڵێ، جەستەکە وەك پێشتریش گوتمان نامێنێ، بەڵکو شی دەبێتەوە بۆ ئەو کەرەستەو توخمە سەرەتاییانەی پێشتر لێیانەوە دروستبووە.

چوار: قوڕئان ڕاگر (عماد)ی ڕێبازی پێغەمبەرە (عليه الصلاة والسلام) واتە: بەهۆی قوڕئانەوە ڕێبازی پێغەمبەری خوا لە دونیای واقیعدا بەرجەستە دەبێت، بەهەمان شێوە ڕووحیش ڕاگری جەستەیە.

پێنج: ڕێبازی پێغەمبەری خوا نشینگەی قوڕئان و شوێنی تێدا بەرجەستەکردنی قوڕئانە، بەهەمان شێوە جەستەش نشینگەی ڕووحەو، ئەو شوێنەیە کە ڕووح دەچێتە نێوی، بەهۆی ڕووحەوە جەستە ئەو جم وجۆڵ و حاڵەتانەی لێ پەیدا دەبن کە دەڵێن: ئەوە جەستەیەکی زیندوویە.

**ب- ئامانج لەدانانی ئەو ناوونیشانە:**

یەك: ڕوونكردنەوەی پێگەو ڕۆڵی هەركام لە قورئان و سوننەت لە دینداریی دا.

قورئان پێگەكەی لەكوێیە و ڕۆڵەكەی چەندە؟ هەروەها ڕێبازی پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام)؟

دوو: خستنەڕووی پەیوەندیی ڕاست و دروست لەنێوان قورئان و ڕێبازی پێغەمبەری خوادا.

سێ: ڕەواندنەوەی تەم ومژی چەند كەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییەك لە بارەی قورئان و سوننەتەوە، لەمامەڵەكردن لەگەڵ قورئان و لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) جاری واهەیە لە قورئاندا زێدەڕۆیی كراوە لەسەر حیسابی ڕێباز (سنة) و كەمتەرخەمیی بەرامبەری و، جاری واش هەیە لەڕێبازی پێغەمبەری خوادا، زێدەڕۆیی دەكرێ، بەكەمتەرخەمیی شكانەوە بەسەر مامەڵە لەگەڵ قورئاندا.

چوار: خستنەڕووی ئەو ڕاستییە كە لایەنە كردەییەكەی قورئان، بەبێ ڕێبازی پێغەمبەری خوا جێبەجێ ناكرێ.

پێنج: پێشتریش گوتمان ڕێبازی پێغەمبەری خوا ڕووحەكەی و جەوهەرەكەی قورئانەو، بەبێ وێناكردن (تصوّر)ی قورئان، ناگونجێ ڕێباز و ڕێ وشوێنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وێنابكەین.



## پێناسەی قورئـان و سوننـەت

بەڕێزان!

زانایان بەگشتیی بنچینەیەکیان داناوە زۆر جوانە دەڵێ: (الحكم على شيءٍ فرعٌ عن تصوُّره) واتە: حوكمدان بەسەر شتێکدا لقێکە لە وێناکردنی، واتە: بۆچوون و تێفکرین و ڕامانت لەبارەی شتەکەوە چۆن بێ، هەڵوێست وحوکمەکەشت بەو شێوەیە دەبێ! ئێمە ئەگەر پێناسەی ڕاست ودروستی قورئان نەزانین و، پێناسەی ڕاست ودروستی ڕێبازی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) نەزانین، زۆرجار بەهۆی ئەوەوە کە لە پێناسەی شتێکدا بەهەڵەدا دەچین، بێگومان مامەڵەیەکی هەڵەشی لەگەڵدا دەکەین.

### أ- پێناسـەی قـورئــان:

لێرەدا چوار پێناسەی قورئانم هێناون لەزانایانەوە:

پێناسەی یەکەم: هی جـورجـانییە کتێبێکی نـاوداری هەیە بەناوی (التعريفات)[1] دەڵێ: (القرآن: هو المنزَّل على الرسول (محمد) المكتوب

---

(١) ص ١٧٢.

في المصاحف، المنقول عنه نقلاً متواتراً بلا شبهة) واتە: قورئان بریتیە لەو دابەزێندراوە بۆسەر (محمد) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە لە موصحەفەکاندا نووسراوەو، بەتەواتور لێیەوە گوازراوەتەوە، بێ ئەوەی هیچ گومان و دوو دڵییەك هەبێ لە گوازرانەوەی دا.

ئنجا وەك لە كتێبی: (با لەخزمەت قورئاندا بین!)دا بەدرێژیی باسم كردوە[1]و، زانایان لە كتێبەكانی خۆیاندا باسیان كردوە كە قورئان بەدوو شێوە بەئێمە گەیشتوە: زارەكیی و نووسین (شفاهاً وكتابةً) قورئانیش دوو ناوی زۆر مەشهووری هەن، ئەوانیش: (القرآن والكتاب)ن، (قرآن): واتە: خوێنراوە، یان چاوگ (مصدر)ە یاخود ناوە (إسم)ە، ئەگەر چاوگ بێ واتە: خوێندنەوەو، ئەگەر ناو بێ واتە: خوێندراوە، قورئان خوێنراوە (مقروء)ەو، ئێمە قورئانمان بە خوێندنەوە (قراءة) پێگەیشتوە، هەروەها قورئان كتێبیشە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ۝١﴾ **الحجر.**

یان دەفەرموێ: ﴿طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ۝١﴾ **النمل.**

بۆچی خوای كاربەجێ ئەو دوو ناوەی بۆ هەڵبژاردوون؟ تاكو خەڵكی هەموو دونیا بزانێ كە ئەو فەرمایشتەی خواو، ئەو وەحییەی خوا، هەم بەشێوەی خوێندنەوە بە ئێمە گەیشتوە، هەم بەشێوەی نووسین، بەشێوەی خوێندنەوە، هەزاران لە هاوەڵان قورئانیان لەبەر بووە، ئنجا وێڕای ئەوەی لەبەریان بووەو لە سینەیاندا پاراستوویانە،

---

(١) بەڵام تێروتەسەلتر لەوە لە كتێبی: (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا) باسی ئەو بابەتەو، گەلێك بابەتی دیكەی پەیوەست بە قورئانمانەوە كردوە.

بەنووسراوییش هەبووە، لەهەردووك ڕێی: خوێندنەوەو نووسینەوەش بەشێوەی تەواتور (تواتر) بە ئێمە گەیشتوە، تەواتوریش ئەوەیە: کۆمەڵێك خەڵك هەواڵێك نەقڵ بکەن کە نەگونجێ لە سەر درۆ کۆببنەوە، بۆوێنە: ئێستا ئێمە لێرە دانیشتووین ئەگەر نەفەرێك بێ بڵێ: فڵان شت ڕوویدا لە فڵان شوێنە، تۆزێك بڕوا دەکەین، بەڵام سەدا سەد نا، دوایی ئەگەر یەکێکی دیش بێ و بەهەمان شێوە بڵێ: شتەکە ڕوویداوە، ئنجا بینە سێ، بینە چوار، بینە بیست، بینە سی (٣٠) کەس، ئەوکات هەرگیز گومانمان نامێنێ، ئنجا ئەوە تەواتورە، بەڵێ تەواتور ئەوەیە هەواڵێك کۆمەڵێك نەقڵی بکەن کە نەگونجێ لەسەر درۆ کۆببنەوە، قورئان بەو شێوەیە بە ئێمە گەیشتوە، هەم بەنووسین هەم بەخوێندنەوە.

پێناسەی دووەم: (الجرجاني) پێناسەیەکی دیکەی قورئان دەکات و دەڵێ: (هو العلم اللَّدُنيِّ ُّ الإجماليُّ الجامعُ للحقائق كلها) واتە: بریتیە لەو زانیارییە تایبەتییە کورتە کۆکەرەوەی هەموو ڕاستییەکان.

پێناسەی سێیەم: دکتۆر (صبحي الصالح) لەکتێبی: (مباحث في علوم القرآن)[1]دا دەڵێ: (القرآن: هو الكلام المعجز المنزَّل على النبي (محمد) المكتوب في المصاحف، المنقول عنه بالتواتر المتعبَّد بتلاوته) واتە: قورئان بریتیە لەو فەرمایشتە دەستەوسانکەرەی دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەر (محمد) کە لەموسحەفەکاندا نووسراوەو بە تەواتور لەوییەوە نەقڵ کراوەو، خوێندنەوەکەیشی بەخوا پەرستیی دادەنرێ.

---

(١) ص ٢١.

پێناسەی چوارەم: هی دکتۆر (عبدالله بن يوسف الجديع)ە، زانایەکی فەرمووودەناسە و فەقیهیشەو ئێستا لەژیاندایە لە شاری (لیدز) لە بەریتانیا دادەنیشێ، دەڵێ: (القرآن: الكتاب العربي المنزل على محمد والمكتوب في المصاحف المبتدأ بالبسملة، فسورة الفاتحة، والمختتم بسورة الناس)[1]، واتە: قورئان بریتیە لەو کتێبە عەرەبییە (ئەو قەیدەی بۆیە لێ زیاد کردوە تاکو دوایی یەکێك کە قورئانی بە ئینگلیزیی، بە هیندیی، بە فارسیی، بە کوردیی، تەرجەمە کرد بە قورئان لەقەڵەم نەدرێ) دابەزێنراوە بۆسەر (محمد) و لە موسحەفەکاندا نووسراوە، بە (بسم الله) و دوایی سوورەتی (الفاتحة) دەست پێدەکات و، بە سوورەتی (الناس) کۆتایی دێ.

خوشك و برا خۆشەویستەکانم!

قورئان تاکە کتێبێکە لەبەر دەستی مرۆڤایەتییدا هەبێ و، لێی دڵنیابێ فەرمایشتی خوایە، ئەو برایەی خۆتان دیراسەی هەموو ئەو کتێبانەی کردوە کە پاڵدەدرێنە لای خوا، بەتایبەت لە مەوسووعە عەرەبییەکەمدا[2]، و لە مەوسووعەی ئیمان وئیلحادیشدا، دیراسەی هەموو کتێبەکانم کردوە: کتێبی صابیئەو، کتێبی مەجووسییەکان و زەرادەشت و، پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ و، هی ئێزیدییەکان کە کۆمەڵێك بوون لە مسوڵمانان جیابوونەوە[3]، ئاماژەیەکم بە هەموو

---

(١) المقدمات الأساسية في علوم القرآن، ص٨ .

(٢) موسوعة: الإسلام كما يتجلىَّ في كتاب الله) کە لە چاپی دووەمی دا دوازدە کتێبە.

(٣) هەرچەندە ئەوان یان بەشێکیان دەڵێن: ئاینیی ئێزیدیی پێش ئیسلامیش هەبووە!

ئەوانە كردوە، ئنجا كاتێك ئەو كتێبانە بەراورد دەكەی لەگەڵ قورئاندا، بەئاشكرا پێت دەڵێن: ئەوانە قسەی بەشەرن، ڕەنگە دەنك دەنك فەرمایشتی خواشیان تێكەڵ بووبێ، بەڵام بەگشتیی قسەی بەشەرن، قسەی بەشەران هەر دیارە و، قورئانیش دیارە كە قسەی خوایە.

(سەید قوتب) ڕەحمەتی خوای لێبێ لەوبارەوە قسەیەكی زۆر جوانی هەیە دەڵێ: هەركەسێك قورئان بخوێنێ و تێی بگا، دەزانێ كە بەشەر قسەی وەك هی قورئان ناكات، لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام) ئایەتی ژمارە (٥٩)دا خوا سبحانه وتعالى دەفەرموێ:

﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: عەمبارەكانی نهێنیی بەس لەلای وین، جگە لەخۆی نایانزانێ و، دەزانێ چی لە وشكانیی و دەریادا هەیەو، هیچ گەڵایەك ناكەوێتەخوار كە نەیزانێ و، هیچ دەنكێك لە تاریكاییەكانی زەویدا نیەو، هیچ تەڕێك و هیچ وشكێك، مەگەر لە كتێبی ڕوونكەرەوە دان.

---

بەڵام وەك لە كتێبی سێیەمی مەوسووعەی: [بیركردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا] بەناوونیشانی: (تەوژمە فیكرییەكانی مێژووی مسوڵمانان)، دا باسمان كردوە یەزیدییەكان لە ئەسڵدا كۆمەڵێك لە شوێنكەوتوانی: شێخ (عدي بن مسافر)ی ئومەویی بوون و، دواتر دووچاری لادان بووە بەهۆی تێپەڕاندن لە خۆشویستنی (یزید) كوڕی (معاوية) و، لە بەرانبەریشدا بوغزاندنی (حسين) كوڕی (علي بن أبي طالب)دا .

بێگومان جێی ئیهتیمامی بەشەر نیە چەند گەڵا لە درەختان دەکەونە خوارێ و، چەند دەنکە تۆو چوونەنێو زەوی و چ تەڕێك چ وشکێك هەیەو....هتد، هیچ بەشەرێکیش ناتوانێ بڵێ: ئەوە دەزانم، بەڵێ قورئان ئەو تاکە فەرمایشتەی خوایە کە لە دەستی بەشەردا بە سەلامەتیی ماوەتەوە، ناڵێین: خوا تەنها قورئانی فەرمووە، خوا فەرمایشتی زۆر کردوون، بەڵام تاکە فەرمایشتێك کە لە دەستی ئێمەدا ماوەتەوەو لێی دڵنیاین فەرمایشتی خوایە، تەنیا قورئانە، ئەویش بەزۆر بەڵگە، یەکێك لە بەڵگەکان ئەوەیە: قورئان سەدو چواردە (١١٤) سوورەتەو، هەرکام لەو سوورەتانە ژمارەی ئایەتەکانی دیارەو، ژمارەی وشەکانی دیارەو، ژمارەی پیتەکانیشی دیارە، قورئان (٦٢٣٦) ئایەتە لێتان تێك نەچێ ئەگەر سەرژمێرێکتان بینی بڵێ: (٦٢١٤) ئایەتە یان (٦٢١٦) هەتا دەگاتە (٦٢٣٦) نەکەونە گومان و بڵێن: ڕەنگە هەندێك لە ژماردنەکان هەندێك ئایەتیان حیساب نەکردبن! نا وانیە، کەمیی و زۆریی، یاخود جیاوازیی ژمارەی ئایەتەکان، دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی ودرێژیی ڕستەکان، با وێنەیەکتان بۆ بێنمەوە لە سوورەتی فاتیحەدا، ئێمە دەخوێنین: (إهدنا الصراط المستقيم) ئەوە ئایەتێك (صراط الذين أنعمت عليهم غير المغضوب عليهم ولا الضالين) هەندێکیان لە (صراط الذين أنعمت عليهم) دەوەستن، ئەوەندە دەکەنە ئایەتێك و، هەندێکیان نایکەنە ئایەتێك، بەڵکو ئەوی دیکەشی لەگەڵ دەخوێننەوە، ئەوجار دەبنە ئایەتێك، بەو شێوەیە ڕستەی واهەیە کردوویانەتە سێ بەش و بۆتە سێ ئایەت، یان بەیەك بەشیان داناوەو بۆتە یەك ئایەت، واتە: جیاوازیی ژمارەی ئایەتەکان دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکانی قورئان.

ئنجا قورئان نەك هەر ژمارەی ئایەتەكانی دیارە، كە (٦٢٣٦) ە، بەڕای زۆربە، بەڵكو ژمارەی وشەكانیشی دیارە، كە (٧٧٤٣٩) وشەیە، بەڵكو ژمارەی پیتەكانیشی دیارە (٣٢١١٨٠) پیتە، ئەمە (إبن كثير) لەسەرەتای تەفسیرەكەی خۆی دا هێناویەتی، كە ئەویش لەزاناكانی دیكەو لە موجاهیدەوە نەقڵی دەكات[1].

بەڵام وەرە تەماشای كتێبەكانی دیكە بكە! من سێ نوسخە لەپەیمانی كۆنم لەلان، كە هەر من سێ نوسخەم لەلان و، ڕەنگە بگونجێ پەنجا (٥٠) نوسخەش پەیدا بكرێ، ئەو سێ نوسخەیە كە تەماشایان دەكەم و بەراوردیان دەكەم، هەركامێكیان لەوی دیكە جیایە! بەڵام قورئان، هەمان ئەو قورئانەی كە لەسەردەمی پێغەمبەردا (عليه الصلاة والسلام) دابەزیوە و نووسراوەتەوەو لەبەركراوەو، دوای خراوەتە نێوان دوو بەرگەوە هەتا گەیشتۆتە ئێمە، نە یەك پیتی كەم نە یەك پیتی زیاد بووە، با لێرەدا ئەم سەرگوزشتەیە بگێڕینەوە:

دەگێڕنەوە حاخامێكی گەورەی جوولەكە یان نەصرانیی لە ڕۆژگاری حوكمڕانیی (مأمون)دا دەبێ، مەئموون كە دەبینێ پیاوێكی زۆر نەجیب و عاقڵە دەڵێ: پێم خۆشبوو مسوڵمان بووبای! ئەویش دەڵێ: ئایا ئیسلام ڕێ دەگرێ من لەسەر دینی خۆم بمێنمەوە؟ دەڵێ: نەخێر، بەڵام پێم خۆشە مسوڵمان بووبای، ئنجا ئەو كابرایە ماوەیەك دیار نامێنێ و دوایی كە دەردەكەوێتەوە، مسوڵمان بووە، مەئموون دەڵێ: بەچی مسوڵمان بووی؟ هەر لەبەر قسەكەی من؟

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ١٤ .

دەڵێ: نەخێر لەبەر قسەکەی تۆ مسوڵمان نەبووم، بەڵام خۆم چووم لێم کۆڵیەوەو ئەزموونێکم کرد، مەئموون دەڵێ: ئەزموونەکە چی بوو؟ دەڵێ: نوسخەیەکم لەپەیمانی کۆن (ی جوولەکەکان) نووسی و، نوسخەیەك لە پەیمانی نوێ (ی نەسرانییەکان) و نوسخەیەکیش لە قورئان، هی جوولەکەکانم بردە نێو جوولەکەکان، کە بەخەتێکی جوان نوسیبوومەوەو دەستکارییم کردبوو، بەڵام کەس نەیگوت: ئەوەت دەستکاریی کردوەو لێیان کڕیم و، ئەوەی نەسرانییەکانیشم بردە نێو ئەوان، ئەوانیش زۆر بەقەدرو حورمەتەوە وەریان گرت، قورئانەکەشم بردە نێو مسوڵمانان، یەك دوویەك تەماشایان کرد و گوتیان: وەرن بیگرن، تۆ دەستکارییت کردوە، گوتم: دەستکاریی چی؟ گوتیان: فلان ئایەتت گۆڕیوەو، فلان ئایەت و فلان وشەیەت دەستکاریی کردوون! منیش گوتم: ئەزیەتم مەدەن لەڕاستییدا بەس بۆ ئەزموونم بووە! ئیدی گەیشتمە ئەو ئەنجامە کە تەنها قورئان ئەو کتێبەیە بگونجێ بڵێی: فەرمایشتی خوایە و دەستکاریی نەکراوە، خواش (سبحانە وتعالی) دەفەرموێ :

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩ ﴾ **الحجر.**

واتە: ئێمە خۆمان زیکرمان دابەزاندوەو خۆشمان پارێزەرینی، بەڵی بێگومان شتێك خوا بیپارێزێ، دەیپارێزێ، ڕەنگە یەکێك پرسیار بکات: بۆچی خوا کتێبەکانی دیکەشی نەپاراستوون؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە: کتێبەکانی دیکە خوا بۆ قۆناغێکی دیارییکراو و، بۆ کۆمەڵگەیەکی دیارییکراو و، بۆ شوێنێکی جوگرافیی دیارییکراویشی ناردوون، بەڵام قورئان مادام بۆ هەموو بەشەرە، بە درێژایی زەمان و بە پانایی

زەمین، دەبووایە پارێزراو بێ، چونکە ئەگەر گریمان گۆڕرابایە، دوای قورئان هیچ کتێبی دیکەی خوا نەدەهاتن گۆڕرانەکە ڕاست بکەنەوە، وەك چۆن قورئان گۆڕران و تێکدرانی کتێبە پێشووەکانی ڕاست کردوونەوە، وەك خوا فەرمووویەتی:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾ النمل.

واتە: ئەم قورئانە زۆربەی ئەوە کە وەچەی ئیسرائیل تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە، بەسەریان دا دەخوێنێتەوە (بۆیان ڕوون دەکاتەوە).

ب- پێناسەی سوننەت:

(سوننەت): زانایان بەچوار شێوە پێناسەیان کردوەو، دوایی پێناسەیەکی پێنجەمی خۆیشم دێنم:

١- زمانزانەکان گوتوویانە: (السنة: الطريقة والسيرة) هەموو فەرهەنگەکانی زمان وا دەڵێن، سوننەت یانی: ڕێباز و پەیڕەو و ژیاننامە[١]، کەواتە: سوننەت لەڕووی زمانەوانییەوە بە مانای ڕێباز دێت، بۆیە ئەگەر وشەی سوننەت بمانەوێ بە کوردیی تەرجەمەی بکەین دەبێ بڵێین: ڕێبازی پێغەمبەری خوا، چونکە دوایی بۆتان

---

(١) (مفردات ألفاظ القرآن) راغب الأصفهاني، ٤٢٩، (المصباح المنير) الفيومي، ١٥٢، (مختار الصحاح )الرازي، ٣١٧.

باس دەكەم كە دەڵێین: سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سوننەت چەند واتاو چەمكێكی جیاجیای بۆ بەكاردێن.

٢- شەرعزانان (الفقهاء)، ئەوان چۆنیان وشەی سوننەت پێناسەكردوە؟ ئەوان وشەی سوننەتیان بە (نَفْل) واتە: (الندب والتطوع) پێناسە كردوە، وەك كتێبی (الإحكام في أصول الأحكام)[١] و (الوجيز في أصول الفقه)[٢] و (أصول الفقه في ثوبه الجديد)[٣] و، كتێبەكانی دیكەش باسیان كردوە واتە: شەرعزانان (فقهاء) وشەی سوننەتیان لە بەرامبەر فەرز و واجیب دا بەكارهێناوە، فەرز و واجیب ئەوەیە ئەگەر بیكەی خێرت دەگاتێ و كە نەیكەی گوناهباری، بەڵام سوننەت ئەوەیە ئەگەر بیكەی خێرت دەگاتێ و، ئەگەر نەشیكەی خێرێكت لەدەست چووە، بەڵام گوناهبار نی، ئەوەش پێناسەی شەرعزانانە بۆ سوننەت.

٣- زانایانی (أصول الفقه) یش چەند پێناسەیەكیان كردووە بۆ سوننەت، بەڵام ئەوە چوارچێوەكەیانە كە دەڵێن: ( ماصدر عن النبـي غير القرآن من فعل أو قول أو تقرير) سوننەت بریتیە لە وەی لە پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) دەرچووە جگە لەقورئان، لە كردار یان وتار یان دانپێداهێنان، هەرشتێك لەپێغەمبەری خواوە دەرچووبێ، لە قسە و لە كردەوە و دانپێداهێنان، وشەی سوننەت دەیگرێتەوە، بەڵام بێگومان جیا لە قورئان[٤].

---

(١) ج١ ، ص١٦١، للآمدي.

(٢) ص ١٦١، للدكتور عبدالكريم زيدان.

(٣) للدكتور مصطفى زلمي .

(٤) الوجيز في أصول الفقه، ص١٦١، هەروەها سەرچاوەكانی دیكەش هێناویانە.

٤- پێناسەی چوارەم: لەلای فەرموودەناسان (المحدِّثين): ئەوان ئاوا پێناسەی سوننەتیان کردوە دەڵێن: (ما أُثِرَ عن النبي من فعل، أو قول، أو تقرير، أو صفة خَلْقية أو خُلقية، أو سيرة، سواء كان قبل البعثة أو بعدها)[1] ، واتە: سوننەت لەڕوانگەی فەرمووەناسانەوە یانی: هەرشتێك کە لە پێغەمبەری خواوە (عليه الصلاة والسلام) گێڕدرابێتەوە و پێمان گەیبێ لە قسە یان کردەوە یان دانپێداهێنان، یاخود سیفەتێکی خەڵقیی پێغەمبەری خوا [باڵای وابوو، چاوی وابوو، ڕەنگی وابوو]، یاخود ئاکاریی [ڕەفتاری وابوو، وا هەڵسوکەوتی دەکرد] یاخود ژیاننامەی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)، ( ئەوە هەمووی دەچێتەوە نێو بازنەی سوننەت) چ لە پێش پێغەمبەرایەتییەوە و، چ لەدوای پێغەمبەرایەتییەوە.

٥- پێناسەی پێنجەم: منیش (عەلی باپیر) ئاوا پێناسەی سوننەتم کردوەو پێم وایە کۆکەرەوەی ئەوانە هەموویانەو زیادەشی تێدایە، دەڵێم: (السنة: هي طريقة النَّبِيِّ الخَاتم لِتَطْبيق القرآن الكريم وتجسيده في الواقع وكيفيَّته) سوننەت بریتیە: لە ڕێبازی پێغەمبەری کۆتایی (صلى الله عليه وسلم) بۆ جێبەجێکردنی قورئان و بەرجەستەکردنی لەسەر ئەرزی واقیع و چۆنیەتییەکەی.

بۆچی سوننەتم ئاوا پێناسە کردوە؟ ئێستا ڕوونی دەکەمەوە: ئێستا زۆربەی هەرەزۆری خەڵك وادەزانن سوننەت شتێکە لەبەرامبەری

---

(١) أصول الفقه في ثوبه الجديد، ص٦٣، ٦٤ ، هەروەها سەرچاوەکانی دیکەش بە تەعبیری دیکەی جیاجیا هێناویانە.

قورئان دا، قورئان لەلایەکەو سوننەتیش لەلایەك، بەڵام ئەگەر بێینە سەرباری حەق وانیە، چونکە:

أ- شەرعزانان (فقهاء) (سنة) بە مانای پەسند و خۆبەخش (ندب و تطوع) دێنن و، لەبەرانبەر پێویست (واجب و فرض)دا، دایدەنێن، بەڵام بێگومان قورئانیش هەندێك شتی فەرمووە، پەسند (ندب)ەو، ئەگەر بیکەی خێرت دەگات و، ئەگەر نەیکەی گوناحت ناگات، هەروەها لەدەقەکانی سوننەتیشدا شت هەیە واجبە و شت هەیە پەسندە.

ب- زانایانی (علم أصول الفقه) کە دەڵێن: سوننەت هەرشتێکە لە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەرچووبێ جگە لە قورئان، ئەوەش نەگونجاوە پێناسەی ڕێبازی (سنة)ی پێغەمبەری پێبکرێ، چونکە بێگومان هەرچی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی و کردوویەتی و دانی پێداناوە، لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا بووە، کەواتە: چۆن و بە چ بەڵگەیەك قورئان لە چەمکی سوننەت دادەڕنرێ؟ بۆیە بە بۆچوونی من ئەو پێناسانە هەریەکەیان لایەکی بابەتەکەیان گرتوە، بەڵام حەقیقەت ئەوەیە کە ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بریتیە لە بەرجەستەکردنی جێبەجێکردنی قورئان لەواقیعدا و چۆنیەتیی ئەو جێبەجێکردنە.

ئێستاش بۆ زیاتر تێگەیشتن لە چەمك و واتا و چییەتی سوننەت، باسەرنجێکی جۆرەکانی بدەین، کە بەلای کەمەوە ڕێبازی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلى الله علیه وسلم) شەش جۆرە:

**جـۆرەكانی سوننـەت:**

ئایا سوننەت، واتە: ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) - لێتان تێك نەچێ! سوننەت بەواتای سیواك كردن و بەرسمێڵ كردن ونوێژی سوننەت و ڕۆژووی سوننەت نیە! بەڵكو واتە: ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) - چەند جۆرە؟ ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەكرێ بۆ چەند جۆرێك دابەش بكرێ و بەلای كەمەوە، شەش جۆرە:

١- جۆری یەكەمی سوننەت: (سنة للتشریع والتبلیغ بمقتضى نُبوَّته و رسالته) ڕێبازی پێغەمبەر ( علیه الصلاة والسلام ) بۆ یاسادانان و بۆ گەیاندن بەپێی داخوازیی پێغەمبەراتییەكەی و ڕەوانەكراوییەتەكەی:

چونكە پێغەمبەرمان (محمد) (علیه الصلاة والسلام) هەم پێغەمبەر (نبي) بووەو، هەم ڕەوانەكراو (رسول)یش بووە، (نبي) چ (فعیل) ی بەمانای (فاعل) بێ، واتە: (مُنْبِـيء) ئەو كەسەی هەواڵ دەدات، چ (فعیل)ی بەمانای (مفعول) بێ واتە: (مُنْبَأ)، واتە: ئەو كەسەی هەواڵی پێدەدرێ، پێغەمبەر هەم هەواڵیشی پێدراوە بەتایبەتی لەلایەن خواوە، هەم هەواڵیشی داوە بەناوی خواوە، بەڵام وێڕای ئەوە ڕەسوولیش بووە واتە: پەیامی خواشی گەیاندوە.

ئەمە جۆری یەكەمی ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) كە بریتیە لە یاسادانان و گەیاندن بەهەموو خەڵك، لەهەموو كات و

لەهەموو شوێنەکاندا، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتوە دەفەرموێ: {إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ}[1].

واتە: کردەوەکان بەگوێرەی نیەتەکانن،ئنجا ئایا ئەمە بۆکەسێکی دیارییکراوەو بۆ کاتێکی دیارییکراوەو، بۆ کۆمەڵێکی دیارییکراوە؟ نەخێر بەڵکو بۆ هەموو کەسە، هەر کەسێك مسوڵمان بێ، کردەوە چاکەکەی بەپێی نیازی نێو دڵی بۆی حیساب دەکرێ، دەتوانین لەم بوارەدا زۆر نموونان بێنینەوەو، زۆربەی ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام ) لەم جۆرەی یەکەمیانە واتە: بۆ یاسادانانەو بۆ گەیاندنە بەهەموو لایەك، لەهەموو کات وشوێنەکاندا.

٢- جۆری دووەمی سوننەت: (سنة بمقتضى إمامته ورسالته)، ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەپێی داخوازیی پێشەوایەتییەکەی و گەیاندنی پەیام:

بەڕێزان تەماشابکەن! پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) هەندێك شتی فەرمووە وەك پێغەمبەری خوا فەرموویەتی و، هەندێك شتیشی فەرمووەو کردوە، وەك حوکمڕان و سەرۆکی دەوڵەت، ئنجا ئەوشتانەی وەك سەرۆکی دەوڵەت کردوونی یان فەرموونی، تایبەتن بەقۆناغی حوکمڕانیی و قەوارەی سیاسییەوە، بۆ وێنە فەرموویەتی: {مَنْ أَحْيا أَرْضاً مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ}[2].

---

(١) أخرجه مالك: ٩٨٣، وأحمد: ١٦٨، والبخاري: ١، ومسلم: ١٩٠٧، والترمذي: ١٦٤٧، وأبو داود: ٢٢٠١، والنسائي: ٣٤٣٧، وابن ماجه: ٤٢٢٧.

(٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد: ١٥١٢٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

واتە: هەركەسێك زەوییەكی بەیار و مردوو زیندوو بكاتەوە، هی خۆیەتی، یاخود فەرموویەتی: (مَنْ قَتَلَ قتيلاً له عليه بَيِّنة فله سَلَبُه) متفق عليه[1]، واتە: هەركەسێك كەسێك بكوژێ (لەجەنگدا) بەڵگەی لەسەری هەبێ، كەلوپەلەكانی هی ئەون، (سَلَبْ) كەلوپەلی بابای جەنگاوەرە، ئنجا ئایا ئەوە پێغەمبەری خوا وەك یاسایەكی گشتیی فەرموویەتی بۆ هەموو حاڵەتان؟ ئایا مامۆستایەك لەسەر مینبەر بۆی هەیە بڵێ: خەڵكینە! (مَنْ أَحْيا أَرْضَـاً مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ)؟ ئنجا سەد (١٠٠) كەس بچنە سەر زەوییەكی بەیار، هەركامیان بڵێ: هی منەو زیندووی دەكەمەوەو لەسەری بەشەڕبێن؟ نەخێر، بەڵكو پێغەمبەری خوا وەك سەرۆكی دەوڵەت وای فەرمووە، سەرۆكی دەوڵەت دەیدات بەفڵان كەس و نایدات بەفڵان كەس، لەبەر فڵان هۆكار و فیسار پاساوی ڕاست و ڕەوا، كە ئەگەر مامۆستایەك فەتوا بدا، هەراو كێشەی لێ پەیدا دەبێ، بەڵام ئەگەر سەرۆكی دەوڵەت وەك دەسەڵاتی سیاسیی، بڵێ ئەوەندە زەوییانە دەدەین بەوەندە خەڵكە، لەبەر ئەو هۆكارانە، هیچ كێشەی لێ پەیدا نابێ!

٣- جۆری سێیەمی سوننەت: (سنة بمقتضى كونه قاضياً أو حاكماً)، ڕێبازی پێغەمـبەر بەحوكمی ئەوە كە دادوەر و قـازیی بووەو وەك دادوەر بڕیارێكی داوە:

مادام لە حاڵەت و دۆخێكی تایبەت دا بووبێ و نیشانەی ڕەهایی و گشتیی بوونی تێدا دیارنەبێ، تایبەت دەبێ بەو كاتەوە، بۆ وێنە:

---

(١) البخاري: ٣١٤، مسلم: ١٧٥١

لەفەرمایشتێکیدا کە بوخاریی وموسلیم هێناویانە دەفەرموێ: { إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَلْحَنُ بِحُجَّتِه مِنْ بَعْض، فَأَقْضِيَ لَهُ بِنَحْوِ مِمَّا أَسْمَعُ مِنْهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِشَيْءٍ مِنْ حَقِّ أَخِيه، فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئاً، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ}[1].

واتە: ئێوە بۆ دادوەریی دێن بۆ لای من، یەکێك لە ئێوە زمانی پاراوترە، ئنجا بەڵگەکەی خۆی باشتر دەخاتەڕوو، ڕەنگە حەقیشی نەبێ، بەڵام من حەقەکەی پێ دەدەم، ئنجا با ئاگاداربێ هەرکەسێك من حەقی برایەکەی پێبدەم (لەبەرئەوەی زمانی ڕەوانترەو بەڵگە چاکتر دێنێتەوەو، بەرامبەرەکەی ڕەنگە ئەو لێزانیی ڕەوانبێژییەی نەبێ)، با دڵنیابێ ئەو حەقی برایەی کە پێی دەدەم، پارچەیەکە لەئاگر بۆی دەبڕم (با دڵی پێ خۆش نەبێ بڵێ: بردمەوە لەدادوەرییەکەدا!) یانی: با وەری نەگرێ و بزانێ کە حەڕامە، مادام دەزانێ بەهۆی زمان پاراویی و زمان لووسییەوە، ئەو حەقەی لەبرایەکەی خۆی زەوت کردوە.

ئنجا ئایا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەگەر ڕۆژێك لەڕۆژان، وەك دادوەر بڕیارێکی بۆ کەسێك دابێ، دەبێتە ئایینێکی پابەندکەر بۆ ئێمە، لەبەرئەوەی کابرا زمان لووس بووەو بەڵگەی چاکتر هێناوەتەوە؟ نەخێر نابێتە ئایین و نابێتە بڕیارێکی پابەندکەر، چونکە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) وەك قازییەك و لەکاتێکی دیارییکراودا ئەوبڕیارەی فەرمووە.

---

(١) أخرجه مالك: ١٣٩٩، وأحمد: ٢٦٦٦٨، والبخاري: ٢٥٣٤، ومسلم: ١٧١٣، وأبو داود: ٣٥٨٣، والترمذي: ١٣٣٩، والنسائي: ٥٤٠١، وابن ماجه: ٢٣١٧.

٤- جۆری چوارەمی سوننەت: (سنة بمقتضى كونه مفتياً)، ڕێبازی پێغەمبەر بەپێی داخوازیی ئەوە کە وەك موفتیی فەتوای داناوە:

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) هەندێ شتی فەرمووە وەك موفتیی، بۆ وێنە: با سەرنجی ئەم دەقە بدەین: {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَتْ هِنْد أُمُّ مُعَاوِيَة: يَا رَسُولَ الله، إِنَّ أَبَا سُفيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ آخذ مِنْ مَالِه شَيْئاً بِغَيْرِ عِلْمِه؟ قَالَ: «خُذِي مَا يَكْفِيكِ أَنْتِ وَبَنِيْكِ بِالمَعْرُوف»}[1].

واتە: هیندی خێزانی ئەبوو سوفیان دایکی موعاوییە (دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا) دەڵێ: ئەبوو سوفیان پیاوێکی ڕژد و چرووکە، ئایا ئەگەر بەبێ ئەوەی خۆی ئاگاداربێ، لە ماڵەکەی گل بدەمەوە، گوناهبار دەبم؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: بایی ئەوەندەی بەشی خۆت و مەسرەفی منداڵەکانت دەکات، لێی گل بدەوە (گوناحبار نابی!).

ئنجا ئایا ئەوە هی ئەوەیە مامۆستایەك لەسەر مینبەر فەتوا بدات و بڵێ: ئافرەتینە! بەو شێوەیە لە ماڵی مێردەکانتان گل بدەنەوە؟ نەخێر، چونکە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) کە ئەو فەتوایەی داوە، وەك موفتییەك و بۆ حاڵەتێکی تایبەت ئەو فەتوایەی داوە.

ئنجا هەندێك لەوانەی وتاربێژن و قسە دەکەن بۆ خەڵك، کەمتەرخەمییەکەیان لێرەدایە، یەکیان فەرمایشتێکی پێغەمبەر

---

(١) أخرجه مسلم كتاب الأقضية، باب: قضية هند، رقم:٧.

(علیه الصلاة والسلام) دێنێ هەروا بەڕەهایی دەیڵێ و ناچێ ڕوونی بکاتەوە، بێگومان پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە ئەو ئافرەتە هاتوە بۆلای، بەڵێ ڕاوییەکە هەرئەوەندەی بۆ ئێمە نەقڵ کردوە، بەڵام بەدڵنیایی پێغەمبەری خوا لێی کۆڵیوەتەوە، یاخود ئافرەتەکەی ناسیوەو ئەبوو سوفیانی ناسیوەو، زانیویەتی ڕاست دەکا، ئنجا ئەو فەتوایەی بۆداوە، کەواتە: ئەوە فەتوایەکە بۆ کەسێکی دیارییکراو و لەکاتێکی دیارییکراودا دەدرێ، بەڵام حوکمێکی ڕەهای لێ وەرناگیرێ، کە هەر ئافرەتێك گلەیی لە مێردەکەی هەبوو و هاتە لای مامۆستایەك، بڵێ: بەکەیفی خۆت لەماڵەکەی گلبدەوەو لێی بدزە! ئەوە نابێت، چونکە مەرج نیە هەر ئافرەتێك گلەیی لەمێردەکەی هەبوو، ڕاست بکا، یان هەیە مێردەکەی نیەتی، دیارە هیند ڕاستی کردوەو ئەبوو سوفیان سامانی بووە بەڵام نەیداوەتێ، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەو فەتوایەی بۆداوە، کەواتە: ئەوەش جۆری چوارەمی ڕێبازی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) کە بریتیە لەوە کە ئەوەی وەك فەتوا فەرموویەتی، دەبێ وەك فەتوا وەربگیرێ، نەك وەك حوکمێکی گشتیی!!

٥- جۆری پێنجەم: (سنة بمقتضى اجتهاده في الأمور الدنيوية كالزراعة والطب والحرب وغيرها)، جۆرێکی دیکەی ڕێبازەکەی پێغەمبەر ئەوەیە کە شتێکی فەرمووە یان بڕیارێکی داوە، بەپێی خواستن و کۆششکردنی خۆی لەکاروباری دونیاییدا، لەکشتوکاڵدا، لەپزیشکییدا، لەجەنگدا:

بۆ وێنە: بەلای کۆمەڵێکدا ڕۆیشتوە کە دارخورمایان موتوربە کردوون فەرموویەتی: پێموایە ئەگەر واش نەکەن زەرەر ناهێنێ، ئەوانیش وازیان لێهێناون و لێیان گەڕاون، یانی: تۆوی نێرەکانیان

نەبردوە بۆ مێیەكان و، سەرەنجام دارخورمایەكان بەریان نەگرتوە، پاشان چوونەوە خزمەتی و گوتوویانە: خورمایەكان بەریان نەگرت؟ فەرمووی: بۆچی؟ گوتیان: تۆ بەوێدا هاتی و فەرمووت: پێموایە ئەگەر واش نەكەن، زەرەری نیە! فەرمووی: وەك دین پێم نەگوتن، بەڵكو وەك بۆچوونی خۆم بوو! چونكە لە مەككە دارخورمای لێنەبووەو، لە مەدینەش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شارەزای ئەو ژینگەیە نەبووە، گوتوویەتی نەوەك بكەونە خوارێ و، شتێكی قورسەو ئەگەر واش نەكەن بەردەگرن، نەیزانیوە بەرناگرن.

ئنجا بۆزانیارییتان! هەرچی ڕووەكە، نێرەو مێیەی هەیە، بەڵام زۆربەیان نێرو مێیەكەیان لەنێوخۆیان دایەو، ئەوی دیكەش لەڕێی هەنگ و پەپوولەو مێش و مەگەزەوە، موتوربە دەبن و، دەگمەنە وەك دارخورما تۆوی نێرەكەی بەشەر بیبات بۆسەر مێیەكەی، ئنجا موتوربە ببێ، ئنجا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: {أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ} (أخرجه مسلم: ٢٣٦٣)[١].

واتە: ئێوە لەكاروباری دنیای خۆتاندا شارەزاترن، هەروەها لە ڕیوایەتێكی دیكەی (مسلم)دا هاتوە: ئەگەر شتێكم پێگوتن وەك وەحیی و دین لێم وەربگرن، بەڵام ئەگەر شتێكم وەك بۆچوونی خۆم پێگوتن، ئێوە لەكاروباری دنیای خۆتاندا شارەزاترن.

---

(١) عَنْ عَائِشَةَ وَعَنْ ثَابِتٍ عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِىَّ -صلى الله عليه وسلم- مَرَّ بِقَوْمٍ يُلَقِّحُونَ فَقَالَ « لَوْ لَمْ تَفْعَلُوا لَصَلُحَ ». قَالَ فَخَرَجَ شِيصًا فَمَرَّ بِهِمْ فَقَالَ: « مَا لِنَخْلِكُمْ؟ ». قَالُوا: قُلْتَ كَذَا وَكَذَا قَالَ: « أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ ».

هەروەها پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کاتێك لەجەنگی بەدردا ویستی لەشوێنێك بارگەو بنەی سوپا بخات، حەبابی کوڕی مونذیر گوتی: ئایا ئەوە بە وەحیی خوایە، یان بۆچوونی خۆتەو تاکتیکی جەنگە؟ پێغەمبەری خواش (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: ڕای خۆمەو تاکتیکی جەنگە، حەبباب گوتی: کەواتە ئێرە باش نیە بابگوازینەوەو بۆی ڕوون کردەوە، بۆچی؟ پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (لقد أَشرت بالرأي)[1]، واتە: بۆچوونی تۆ ڕاستە.

هەروەها ویستی سوڵح لەگەڵ هۆزی (غطفان)دا بکا، (سەعدی کوڕی موعاز و سەعدی کوڕی عوبادە)ی بانگ کردن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو سوڵحەی بۆمان دەکەی، کە سێیەکی بەروبوومی مەدینە بدەینە (غطفان) هی ساڵێك، ئایا ئەوە فەرمانی خوایە، یان بۆچوونی خۆتەو لەبەر مەسڵەحەتی ئێمەیە؟ فەرمووی: هەر بۆچوونی خۆمە، تەماشادەکەم عەرەب هەموویان (لەکەوانێکەوە تیرتان تێدەگرن)[2] گوتم: با تۆزێك دوژمنتان لێ کەم بکەمەوە، ئەوانیش گوتیان: (والله لا نعطیهم إلا السیف) بەخوا شمشێر نەبێ نایاندەینێ، هەروەها گوتیان: ئەوانە پێش ئەوەی خوا ئێمە بەهۆی تۆ و ئیسلامەوە بەڕێزبکات، تەماعیان لەماڵی ئێمەدا نەبوو، مەگەر بە کڕین وپارە یان بەمیوانداریی، ئێستا چۆن دەیاندەینێ؟! پێغەمبەری خواش فەرمووی: بۆخۆتان دەزانن، هەرچەندە نووسیبووشیان،

---

(١) السیرة النبویة لابن هشام، ج٢، ص ٣٣٦.

(٢) واتە: زۆرێك لە تیرەو هۆزە بیروڕایەکانی عەرەبی ئەوساکە، لەدژتان کۆبوونەوەو گەلەکۆمەکێتان لەدژدەکەن.

فەرمووی: بیدڕێنن، چونکە هەردووك سەعد، سەرۆكی عەشیرەتی ئەوس و خەزرەج بوون و، لەوەدا شارەزاتر بوون، ئەوەش نوقسانیی نیە بۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)[١].

٦- جۆری شەشەمی سوننەت (ڕێبازی پێغەمبەر) (علیه الصلاة والسلام)، (سنة بمقتضی جِبِلَّته البشريَّة كحبِّه للحلواء والعسل) ڕێبازی پێغەمبەر بەپێی سرووشتی بەشەریی، وەك پێخۆشبوونی حەڵوا و هەنگوین:

بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك بەشەر هەندێك شتی پێخۆش بووە، هەندێك شتی پێناخۆش بووە، هەروەها جۆرە بەرگێكی پۆشیوەو، جۆرە پێڵاوێكی لەپێ كردوەو، لەڕۆژگاری خۆیدا جۆرە چەكێكی بەكارهێناوە، جۆرە وەسیلەیەكی بۆ سواریی بەكارهێناوە، ئایا هەموو ئەوانە بۆ ئێمە دەبنە ڕێباز؟ بەتەئكید نەخێر، چونكە وەك بەشەر و سرووشتی بەشەریی ئەوەی كردوە، بۆ وێنە ئەم فەرموودەیە دێنین: { عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صلی الله علیه وسلم- يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ}[٢].

واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حەڵوا و هەنگوینی پێخۆش بووە، ئنجا ئایا بەشێك لە شوێنكەوتنی پێغەمبەرە هەموومان شیرنەمەنیی و هەنگوین بخۆین، ئەگەر كەسێك نەخۆشیی شەكرەشی هەبێ؟ بەتەئكید نەخێر، چونكە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك بەشەرێك شتێكی پێخۆش بووەو، شتێكی دیكەی پێناخۆش

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٣، ص ١٠٨، ١٠٩.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٢٧٧، ومسلم: ٣٧٥٢.

بووە، لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە، جارێك (ضب)یان هێنایە سەر سفرەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) {یانی: (بزنمژە) کە شتێکە وەك قۆڕیی و لەبیابانە} کە هێنایانە پێشی، یەك دوو ئافرەت گوتیان: ئاخر بە پێغەمبەری خوا بڵێن ئەوە چییە! (نەچوون هەر بەزیندوویی بیهێنن، بەڵکو گۆشتەکەیان بۆ هێناوە) نەوەك نەیخوا، گوتیان: ئەی پێغەمبەر! (صلی الله علیه وسلم) ئەوە(ضَبّ)ە! ئەویش دەستی کێشایەوەو فەرمووی: {...لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ}[(١)].

واتە: دڵم نایباو بێزم لێهەڵدەستێ، چونکە لە وڵاتی خۆم دا نەبووە، خالیدی کوڕی وەلید ڕایکێشایە پێش خۆی و خواردی، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) تەماشای دەکرد بەسەرسوڕمانەوە کە چۆنی بۆدەخوریێ! خالید لێی پرسی: ئایا حەڕامە؟ فەرمووی: نەء بەڵام من دڵم نایبا.

یان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنیوەدوورگەی عەڕەبیی دا بووەو، ئەو پۆشاکەی لەبەرکردوە کە لەگەڵ ژینگەو ئاووهەوای ئەوێ دەگونجێ، جاری دیکەش لەهەندێ کتێبی خۆم دا نووسیومە، جارێك سەفەری ئەڵمانیام کرد، گەنجێکی ئەڵمانیی کە مسوڵمان بوو بوو، تەماشام کرد دشداشەیەکی لەبەربوو، کڵاوێکی سپی لەسەربوو، ڕیشێکی بەردابۆوەو نەعلێکی لەپێ بوو و، ناوێکی دیکەی هەبوو ناویشیان لێنابوو (یەحیا) ناوەکەشیان لێگۆڕیبوو! منیش گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتیان: ئەوە گەنجێکی ئەڵمانییە مسوڵمان بووە، گوتم: ئەدی

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٢١٧، ومسلم: ٥١٤٦، وابن حبان: ٥٢٦٣.

بۆچی واتان لێکردوە؟ گوتیان چیمان لێکردوە؟! گوتم: ئەو دشداشە چییە؟ لێرە بەرگی دیکە هەیە، کڵاو لەسەرو نەعل لەپێ؟ ڕیشەکە قەیناکات کە زۆربەی زانایان دەڵێن: سوننەتە! گوتیان: بۆچی ئەو شتانە سوننەت نین؟ گوتم: نەخێر هیچیان سوننەت نین و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر لێرەبووایە لە ئەڵمانیا، هەم ئەڵمانییانەو بەئەڵمانیی قسەی دەکرد، هەم بەرگی وانیشی لەبەردەکرد، هەروەها عادەتەکانی وانیشی ڕەچاودەکردن، مەگەر شتێك لەگەڵ شەرع دا دژ وەستابایە، دوایی گوتم: لە کاك یەحیا گەڕێن بابەرگی خۆی لەبەربکات، ئێستا ئێوە کردووتانە بەشتێکی نامۆو نەگونجاو لەگەڵ قەومەکەی خۆیدا، باپۆشاکی خۆی لەبەربکات و، بەزمانی ئەڵمانیی بدوێ و، با کڵاوەکەشی لەسەر سەری لابچێ، گوتیان: بۆ نوێژیش سوننەت نیە؟ گوتم: نەخێر بەڵگەیەکی تایبەتی سەلمێنەری لەسەر نیە.

بەڵێ ئەو شتانەی پێغەمبەری خوا وەك بەشەرێك کردوونی و، وەك سرووشتی خۆی حەزی لێبوون یان پێیناخۆشبوون، ئەوەش جۆرێکە لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا، بەڵام پابەندکەر (مُلْزِمْ) نین بۆ هیچکەس، وەك ئایین و دینداریی.

ئێستاش بابچینە سەر تەوەری سێیەم بۆ ئەوەی زیاتر ئەوەمان بۆ ڕوون بێتەوە کە چۆن قورئان و سوننەت وەك ڕووح وجەستە تێکهەڵکێشن و، هیچ کامیان بەبێئەوی دیکە نایکرێ



## بەبێ قورئان نازانین ئیسلام چییە و،
## بەبێ سوننەتیش نازانین قورئان چۆن جێبەجێ دەكرێ؟

خوشك و برا خۆشەویستەكانم! ئامۆژگارییەكی دڵسۆزانەتان دەكەم: ئەگەر دەتانەوێ لە ئیسلام حاڵیی بن، پێویستە سەرەتا لە قورئانەوە دەست پێبكەن، هەوڵبدەن: ڕاست و باش بیخوێننەوە، ئەوەندەی دەتوانن لێی لەبەربكەن و، تێیبگەن و پێیدا قووڵ بنەوەو تێوەی ڕامێنن، پاشان بگوازنەوە بۆ موتاڵاو تێگەیشتنی سوننەت، هەندێ خەڵك دەچێ زۆر خەریكی دەقەكانی سوننەت دەبێ و، خەریكی سەنەدەكانی دەبێ و، خەریكی ڕاوییەكانی دەبێ، خۆی بەو شتانەوە سەرقاڵ دەكا، دوایی دەڵێ: ئەوەندە فەرمایشتەی لەبەرن بە سەنەد و ڕاوییەكانەوە! ئنجا ئایا بەوە لە ئیسلام تێدەگات؟ نەخێر، دەتوانێ بڵێ ئەوەندە فەرموودەم لەبەرن بەسەنەدەوە، بەڵام ئایا دەتوانێ بڵێ: لە ئیسلام تێگەیشتووم؟ بێگومان: نەخێر، چونكە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) كە هات بەس قورئانی پێبوو و فەرمووشی: (لاتكتبوا

عنِّي ومَنْ كتب شيئاً غير القرآن فَلْيَمْحُه)[١] واتە: (ئەو شتانەی دەیانڵێم (فەرموودەكانم) مەنووسنەوە و هەركەسێ شتێكیشی نووسیوە، جگە لە قورئان با بیسڕێتەوە) ئەوەش بۆئەوەی خەڵك هەر لەگەڵ قورئاندا خەریك بێت، چونكە قورئان مەتنی ئیسلامە، (أبوبكر) خوا لێی ڕازی بێ وەك لەو كتێبەی خۆمدا: {پێناسەو پێویستیی وگرنگیی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)} باسم كردوە، لەڕۆژگاری خۆیدا ویستی فەرموودەكانی پێغەمبەر بنووسێتەوە، ژمارەیەكیشی نووسیبوون لەهەندێ كاغەزاندا، بەڵام لەكاتی پێش وەفاتی دا بەدایكمان عائیشەی گوت: ڕۆڵە! ئەو پەڕانەم بۆ بێنە هێندێك حەدیسم تێدا نووسیون، بیانسووتێنە، گوتی بۆچی؟ گوتی: بەخوا نامەوێ هیچ شتێ لەگەڵ قورئانێ دا تێكەڵ بێ[٢].

هەروەها عومەری كوڕی خەتتاب، خوا لێی ڕازی بێ بە مسوڵمانانی گوت: ئەرێ مسوڵمانینە! ڕاتان چییە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) كۆبكەینەوە؟ ماوەی یەك مانگ ئیستیخارەی كرد، مسوڵمانان گوتیان: باشە با بیاننووسینەوە، بەڵام دوای مانگەكە عومەر گوتی: بۆم دەركەوت كە نەیاننووسینەوە، چونكە تەماشادەكەم: (تەماشابكەن! ئەوانە چەند دووربین بوون و چەند شارەزای دنیاو واقیع بوون) خاوەن كتێبەكان بەهۆی قسەی زاناكانیان و شەرح و تەفسیری زاناكانیانەوە، كە تێكەڵ بەكتێبی

---

(١) رواه مسلم: ٣٠٠٤ وأحمد: ١١٣٦٢ وابن حبان: ٦٢٥٤ وغيرهم.

(٢) تذكرة الحفاظ ج١ ص٥.

خوایان كردوە، سەریان لێشێواوە[١]، هەركەسێك هاتوە بەجۆرێك لەو فەرمایشتەی خوا تێگەیشتوەو، ئەزموون و شەرحی خۆی وەك وەحیی نووسیوەتەوە و، سەرەنجام سەریان لێشێواوە! دەزانن كەی بەڕەسمیی دەست بە نووسینەوە (تدوین)ی سوننەت كرا؟ لەسەردەمی (عمر)ی كوڕی (عبدالعزیز)دا خوا لێی ڕازی بێ لەساڵی (٩٩)ی كۆچییدا، بەڵام وەنەبێ بەس ئەوكاتە سوننەت نووسرابێتەوە، بەڵكو لەسەردەمی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام)، (عبدالله بن عمرو بن العاصي) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ هەرچی دەیفەرمووی دەینووسمەوە، هاوەڵەكانم پێم دەڵێن: پێغەمبەری خوا جاری وایە تووڕە دەبێ، جاری وایە ڕازی دەبێ، چۆن هەموو شتێك دەنووسی؟! ئایا نەیاننووسمەوە؟ فەرمووی: بنووسە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، لەو دوو لێوەی من حەق نەبێ نایەتە دەرێ![٢] ئەدی بۆچی بە هەندێكیانی فەرمووە: مەنووسن؟ ڕەنگە تێیرا نەبینیبن كە بەئەمانەتەوە دەینووسن، یان لەبەرئەوەی ڕەنگە لەگەڵ قورئانێ لێیان تێكەڵ بێ، یان لەخوێندەوارییەكەیان ڕەنگە ڕازی نەبووبێ، بەڵام (عبدالله)ی كوڕی عەمری كوڕی عاص دیارە پێغەمبەری خوا لەخوێندەوارییەكەی ڕازی بووە، یان لەبەر ئەوەی قورئانی لەبەربووەو، زانیویەتی لەگەڵ قورئان دا لێی تێكەڵ نابێ، لەوی ڕابینیوە و گوتوویەتی: بنووسە! هەروەها لە صەحیحی بوخارییدا[٣]

---

(١) طبقات ابن سعد ج٣ ص١ وكنز العمال ج٥ ص٢٣٩.

(٢) أخرجه أحمد: ٦٩٣٠، قال شعيب الأرنئوط: صحيح لغيره.

(٣) البخاري: ٢٣٠٢ وأحمد: ٧٢٤١ والترمذي: ٢٦٦٧ .

هاتوە: (ئەبوو شاە) کابرایەك بوو لەیەمەنەوە هاتبوو جارێکیان کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتارێکی دا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) ئەو وتارەی فەرمووت، بۆ من زۆر گرنگە، بەڵام بۆم لەبەر ناکرێ، فەرمووی: (أکتبوا لأبي شاە) ئەو وتارە بۆ ئەبوو شاە بنووسنەوە، کەواتە: لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) نووسینەوەی سوننەت هەبووەو، لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانیش دا هەبووە، بەڵام سوننەت هەمووی بەڕەسمیی تۆمار نەکراوە، کە بخرێتە نێوان دووبەرگەوە وەك قورئان، بەڵکو لەسەردەمی عومەری کوڕی (عبدالعزیز)دا دەست بەوە کرا، کە ئەوەش بەچەند قۆناغێك تەواو بوو، کەواتە: ئێمە ئەگەر بمانەوێ ئیسلام وەك خۆی بناسین، دەبێ لەڕێی قورئانەوە بێ و، بەهۆی قورئانەوە دەزانین ئیسلام یانی چی؟ بەڵام ئایا چۆن دەتوانین قورئان جێبەجێ بکەین؟ لایەنە کردەییەکەی دەڵێم، لێتان تێکەڵ نەبێ، قورئان بۆخۆی ڕوونە، بۆئەهلی خۆی و کەسێ شارەزای زمانی عەرەبیی بێ، بەڵام لایەنە کردەییەکەی قورئان، بەهۆی سوننەتی پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) بۆمان جێبەجێ دەکرێ، بۆوێنە: خوا دەفەرموێ: حەج بکەن، چۆنی بکەین؟ هەروەها خوا دەفەرموێ: نوێژ بکەن، چۆنی بکەین؟ یان خوا (سبحانه وتعالی) دەفەرموێ: فڵان کارە بکەن، چۆنی بکەین؟ بۆ ئەوە تەماشای ڕێبازی پێغەمبەر دەکەین:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ **الأحزاب.**

تەماشای ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بکە، دەزانی نوێژ چۆن دەکرێ، چەند نوێژن و، یەکی چەند ڕکاتیان هەیە، ڕکووعیان چۆنە، سەجدەیان چۆنە؟

هەروەها دەزانی حەج چۆن دەکرێ و خواپەرستییەکان (مناسك)ی حەج کامانەن؟ بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) جگە لەوەی کە (١٠) ساڵان لە مەدینە نوێژی بەجەماعەت بۆ مسوڵمانان کردوە، بەلای کەمەوە، دوو جارانیش وەك لە صەحیحی بوخاریی دا[١] هاتوە، لەسەر مینبەر نوێژی کردوەو فەرموویەتی: تەماشام بکەن چۆن نوێژ دەکەم! {صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي} چۆنتان دیت نوێژم کرد، ئاوا نوێژ بکەن، هەروەها فەرموویەتی: {لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ}[٢] حەجی کردوەو فەرموویەتی: سەرنجم بدەن بۆئەوەی خواپەرستییەکانی حەج لە من وەربگرن، هەروەها شتەکانی دیکەش بەهەمان شێوە، کەواتە: ئێمە بەهۆی ڕێبازی پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) دەزانین قورئان لەلایەنە کردەییەکەیەوە، چۆن جێبەجێ دەکرێ؟ بەڵام بووناسییەکەی و، ئیمان و عەقیدەکەی و، ڕاستییەکانی کە قورئان گرتوونیە خۆی، لەوبارەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: قورئان ڕۆشنەو ڕۆشنکەرەوەیەو، هەموو کەس تێی دەگا، بەڵام بەمەرجێك ئامرازی تێگەیشتنی قورئانی پێبێ، کە شارەزاییە لەزمانی عەرەبیی.

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٣١.

(٢) أخرجه مسلم: ١٢٩٧، وابن خزيمة: ٢٨٧٧.




## ئیمتیازەكانی قورئان بەسەر سوننەتدا

خوشك و برا خۆشەویستەكانم! قورئان چەند ئیمتیازێكی هەن بەسەر سوننەت دا و، دەبێ وریابین بەبیانووی دیفاع كردنەوە لە سوننەت، زوڵم لەقورئان نەكەین و، بەبیانووی دیفاع كردنەوە لە قورئانیش، زوڵم لەسوننەت نەكەین، بەڵكو دەبێ ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك خۆی تەماشا بكەین و، قورئانیش وەك خۆی تەماشا بكەین، بەلای كەمەوە قورئان پێنج ئیمتیازو پلەی هەن بەسەر ڕێبازی پیغەمبەردا (عليه الصلاة والسلام):

**ئیمتیازی یەكەم: قورئان دەقی فەرموودەی خوایە:**

ڕێك خوا چی فەرمووە، جیبریل داییەزاندوە بۆ سەر دڵی موحەممەد (عليه الصلاة والسلام)، بەڵام سوننەتی پێغەمبەری خوا یانی: دەقەكانی وفەرمایشتەكان، داڕشتنی خودی پێغەمبەرن (عليه الصلاة والسلام) بەفەرموودە قودسییەكانیشەوە، فەرموودەی قودسیی ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا، لەخواوە نەقڵ دەكا ڕاستەوخۆ، بەڵام بەداڕشتنی خۆی دایدەڕێژێ.

## ئیمتیازی دووەم: قورئان دەستەوسانكەر (معجز)ە:

كەس ناتوانێ وەك قورئان بڵێ، بەڵام ئایا كەس ناتوانێ وەك پێغەمبەر بڵێ؟ با، دەزانین ئەو هەموو درۆو دەلەسە بەناوی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) هەڵبەستراون، بۆوێنە: (السلسلة الصحيحة)ی شێخ ئەلبانیی ڕەحمەتی خوای لێبێ یازدە (١١) بەرگە، بەڵام (السلسلة الضعيفة)كەی نیزیكەی دوو هێندەیە بیست (٢٠) بەرگە!! هەروەها (تذكرة الموضوعات)ی (إبن الجوزي) و (اللآلیء المصنوعة في الأحاديث الموضوعة)ی السیوطي و، زۆر كتێبی دیكەش، كەواتە: دەگونجێ بەناوی پێغەمبەرەوە شت هەڵببەسترێ، چونكە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەشەرە، بەڵێ زۆر ڕەوانبێژو زمانپاراوو شارەزابووە، بەڵام هەرچۆن بێ بەشەر بووە، خەڵك توانیویەتی وەك قسەی وی بكات، بەڵام ئایا كەس توانیویەتی وەك قورئان بڵێ و، قسەو دەربڕین ئەنجام بدات؟! بێگومان نەخێر.

**ئیمتیازی سێیەم: خوێندنەوەی قوڕئان عیبادەتە (المتعبَّدْ بتلاوته):**

بەڵام خوێندنەوەی دەقەکانی سوننەت عیبادەت نیە، بێگومان بەگشتیی عیبادەتە ئێمە لە سوننەت تێبگەین، بەڵام بێنی حەدیسان بخوێنیەوە وەك قوڕئان بخوێنیەوە، عیبادەت بێت؟ نەخێر، هیچ زانایەکیش وای نەگوتوە، ئنجا ئەوە هەر بۆخۆشی بۆتان دەگێڕمەوە: کاتی خۆی ناپلیۆن لەساڵی (١٧٩٩)ز دا کە چووە میسری گرتوە، زانایانی ئەزهەر کۆدەبنەوەو دەڵێن: چی بکەین بۆئەوەی ئەو بەڵایە خوا دەفعی بکا؟ دەڵێن: واباشە صەحیحی بوخاریی بخوێنینەوەو، دادەنیشن بەکۆمەڵ کتێبەکەی بوخاریی دەخوێننەوە، بەڵام ناپلیۆن هەردێت و ناگەڕێتەوە!! چونکە هەر لە صەحیحی بوخارییدا هەیەو لەپێش ئەویش لەقوڕئاندا هەیە: ئەگەر دوژمن هات دەبێ هێزی بۆ ئامادە بکەی:

﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ٦٠ ﴾ الأنفال.

بەڵام حەدیسان بخوێنیەوە بۆئەوەی دوژمن دەفع بێ، بێگومان دەفع نابێ و، ئەو کۆمەڵەش تێگەیشتنەکەیان ئەوەندە بووە ئەوکاتە!!

**ئیمتیازی چوارەم: قورئان هەمووی بەتەواتور بەئێمە گەیشتووەو هەمووی موتەواتیرە لەڕووی سەنەدەوە:**

بەڵام سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وانیەو کەمێکی زۆر کەمی (متواتر)ەو بەشێکی (صحیح)ەو، بەشێکی (حسن)ەو، هەشە بێهێزە، واتە: پاڵدرانی بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، هەڵبەتە هی هەڵبەستراویش هەیە بەدەمی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم).

کەواتە: ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاوتاو بەرانبەرو هاوکووفی قورئان نیە، بۆیەش ئەوەتان پێدەڵێم، چونکە هەندێك لەوانەی زیادەڕۆیی (غلوّ)یان کردوە لە سوننەت دا گوتوویانە: سوننەت دادوەر (قاضي)ە بەسەر قورئاندا، کە ئەوە قسەیەکی بێ بناغەیەو، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، هەرگیز شتێکی نەفەرمووە کە لەگەڵ قورئاندا دژ بوەستێ و، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەهەموو کەس ملکەچ تر بووە بۆ قورئان و، لەقورئاندا خوای پەروەردگار چەند جاران ڕەخنەی لەپێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) گرتوە.

**ئیمتیازی پێنجەم: قورئان سەرجەم ئیسلامی تێدایە، بەڵام سوننەت تەنیا لایەنە كردەییەكی ئیسلامی تێدایە:**

ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتوە باسی بووناسیی ئیسلامیی بكات، هەروەها باسی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی و ڕاستییەكانی ئیسلام و، حەڵال و حەرام هەمووی بكات؟ نەخێر، مەگەر جارجار تیشكی خستبێتە سەر بابەتێك، ئەگەرنا ئەوەی قورئان فەرموویەتی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەتەما قورئان لێی گەڕاوە! ئێستاكە دەبینن وتاربێژەكان زۆرجاران هەر حیكایەت و میكایەت دەگێڕنەوە، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) وتارەكانی بەزۆریی ئایەت بوون، لە (سنن)ی (أبو داود)دا هاتوە كە یەكێك لە هاوەڵان دەڵێ: [ما أَخذْتُ (ق) إِلّا منْ في رسول الله (صلى الله عليه وسلم) كان يقرؤها في كلِّ جمعة][1] واتە: من سوورەتی (ق)م بەس لە زاری پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) وەرگرتوە، كە لە وتاری ڕۆژانی جومعەدا دەیخوێندەوە، یەكێكی دیكە گوتوویەتی: فڵان سوورەتەم لەدەمی موبارەكی پێغەمبەر وەرگرتوە، واتە: وتارەكەی هەر بریتیی بووە لەو سوورەتە كە خوێندوویەتەوە، ڕەنگە جارجاریش ئایەتێك كە زانیبێتی ماناكەی زۆر ڕوون نیە، بۆی ڕوون كردبنەوە.

بەڵێ لەڕاستییدا تەنیا قورئان باسی سەرجەمی ئیسلام دەكا، وەك لە مەوسووعە عەرەبییەكەم: (الإِسلام كما يتجلّى في كتاب

---

(١) سنن أبو داود: ١١٠٢ وصححه الألباني في (صحيح سنن أبي داود).

الله)دا، ڕوونم کردۆتەوە، کە قورئان پەکت ناخات بۆ باسکردن و ڕوونکردنەوەی هیچ لایەنێکی ئیسلام، بەڵام سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) وانیە، چونکە ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لایەنە کردەییەکەی ئیسلام، بۆ ئێمە بەرجەستە دەکات، لایەنە کردەییەکەی قورئان، بەڵام ئەوەی کە قورئان فەرموویەتی و ڕوونی کردۆتەوە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەپێویستی نەزانیوە ڕوونی بکاتەوە، چونکە زۆرباش لەقورئاندا ڕوون کراوەتەوە.

لەوبارەوەش ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر هەیە: {إِنَّمَا هُمَا اثْنَتَانِ الْكَلَامُ وَالْهَدْيُ، فَأَحْسَنُ الْكَلَامِ كَلَامُ اللَّهِ، وَأَحْسَنُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم}[١].

دەفەرموێ: ئیسلام بریتیە لەدوو شت: فەرمایشت و ڕێوشوێن، باشترین فەرمایشت فەرمایشتی خوایەو، باشترین ڕێوشوێن ڕێوشوێنی موحوممەدە (علیه الصلاة والسلام)، فەرمایشتی خواش قورئانەو، ڕێوشوێن و ڕێبازیش جێبەجێکردنی پێغەمبەری خوایە (علیه الصلاة والسلام) بۆ قورئان.

بۆیەش پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بۆ ناساندنی ئیسلام، پشتی بە قورئان بەستوەو، مەگەر بەدەگمەن و بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستێك، ئەگەرنا ئەوەی لەقورئاندا هاتوە لە بوارەکانی: بوونناسیی، ئیمان و عەقیدە، تێڕوانین، ڕەوشتەکان، حەڵاڵ وحەڕام، سیاسەتی

---

(١) أخرجه ابن ماجه: ٤٦، والطبراني: ٨٥١٨.

شەرعیی، جەنگ و جیهاد، ئاشتیی، پەیوەندییەكان، قورئان زۆر بەڕوونیی و بەوردیی نوختەی خستۆتە سەر پیت و، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەلای ئەوشتانەدا نەچووە، مەگەر شتێك پەیوەندیی بەلایەنی پراكتیزە و جێبەجێكردنەوە هەبووبێ.

ئنجا كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿...وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ ...﴿٨٩﴾﴾ النحل.

قورئانمان دابەزاندۆتە سەر تۆ ڕوونكەرەوەی هەموو شتێك بێت، واتە: هەرشتێك كە پێویست خوا بیفەرموێ و ڕوونی بكاتەوە، خوا ڕوونی كردۆتەوە، نەك هەموو شتێك بەڕەهایی، بەڵكو ئەو شتانەی وەك دینداریی پێویستمانن.

هەروەها كە لە سووڕەتی (النحل)دا دەفەرموێ:
﴿..وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾.

ڕەنگە یەكێك بڵێ: پێشتر خوا دەفەرموێ: قورئان ڕوونكەرەوەیە بۆ هەموو شتێك، لێرەش دەفەرموێ: قورئانمان بۆتۆ دابەزاندوە تاكو ئەوەی بۆیان دابەزێنراوە، ڕوونیبكەیەوە بۆیان و بەڵكو خۆشیان بیربكەنەوە، ئنجا ئەگەر قورئان ڕوونكەرەوەیە بۆ هەموو شتێك، ئەدی بۆچی پێغەمبەر ڕوونی بكاتەوەو بۆخۆشیان بیر بكەنەوە؟! وەڵامەكەی ئەوەیە:

أ- هەندێك لەزانایان گوتوویانە: ڕوونكردنەوەی پێغەمبەر (عليه الصلاة

والسلام) بۆ قورئان، ئەوەیە کە بۆیان بخوێنێتەوەو، خوێندنەوەکەی ڕوونکردنەوەکە بووە.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بۆ قورئان واتە: بۆیان ڕوون بکاتەوە چۆن جێبەجێ دەکرێ، لایەنە کردەییەکەی؟ ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە؟ بەڵگەمان ئەوەیە (التفسیر النبوي للقرآن الکریم) کوا، لەکوێیە؟! هەموو دەقەکانی سوننەت بگەڕێ، ئەو ئایەتانەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) قسەی لەسەر کردوون، پێم وانیە بگەنە سەد (١٠٠) ئایەت، ئەدی ئەو هەموو (٦٢٣٦) ئایەتە، ئایا پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دانیشتوە ڕوونیان بکاتەوەو تەفسیریان بکا؟ نەخێر، چونکە قورئان بۆخۆی ڕوونەو، ئەوەی بۆ ئێمەی ڕووونکردۆتەوە، هەر ئەوەیە: ئەو ئەرکانە چۆن جێبەجێ دەکرێن؟ چ دروشمەکانی خواپەرستیی، چ لایەنەکانی دیکەی سیاسەت و جەنگ و ئاشتیی، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) ئەوەی بۆ ئێمە ڕوونکردۆتەوە.




## ڕوونکردنەوەی چەمکی کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆیی، لەبواری مامەڵە لەگەڵ قورئان و سوننەت دا

**یەك: سەرگەرم بوون بەسوننەت و زانستەکانی سوننەتەوە، پێش تێگەیشتنی قورئـــان و، پێش بەپێوەرگرتنی قورئان و، سەرەنجام سەرهەڵدانی دیمەنێکی کاریکاتێریی لەدینداریی:**

ئەوە دەبێ بۆتان ڕوون بکەمەوە، هەندێ کەس دەبینی کە خۆی پێ لەخەڵکی دیکەش مسوڵمانترو بەدینترە، بەڵام کە تەماشای دینداریەکەی دەکەی، دیمەنێکی کاریکاتێریی هەیە، کاریکاتێر دەزانن یانی چی؟ ئەها کاریکاتێرێك دروست دەکەن سەری زۆر گەورەیەو لاقی زۆر باریکە، یان دەستی زۆر گەورەیە، ئەوەش هەمووی ڕەمز و هێمایە، مسوڵمانێك دەبینی کە لەڕووی قورئانەوە لەئیسلام حاڵیی نەبووە، دەبینی زۆری حەدیس لەبەرن، بەڵام ئاگای لە قورئان نیە، زۆری سەنەدی حەدیسانی لەبەرن، بەڵام ئاگای لە تەفسیری قورئان نیە، یان زۆر خەریکی سوننەتانە، بەڵام گەلێك واجبی چواندوون، یاخود لەڕووی دینداریی شەخسییەوە، هەندێك

شتی زۆر وردی زۆر لەخۆی گەورە کردوون، بەڵام شتی زۆر گەورە گەورەی ئیهمال کردوون! بەتایبەت ئەوە لە وڵاتانی کەنداودا زۆرە، بۆوێنە دەڵێن: خۆپێشاندان قەدەغەیە، مانگرتن قەدەغەیە، ڕەخنەگرتن لەدەسەڵات قەدەغەیەو نابێ، بەڵام سەرگەرمی ئەوەن ئافرەت! بۆچی نیقابت نەکردوە؟ پیاو! بۆچی ڕیشت درێژ نیە؟ یان بۆچی ڕیشت بۆیاغ نەکردوە؟ تۆ جارێ بنەماڵەیەك حوکمڕانییت دەکا، وەك مەڕو ماڵات مامەڵەت لەگەڵدادەکا، بۆچی لەوەش ناپێچیەوە؟! بۆچی لەوە ناپێچیەوە کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: {سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ: حَمْزَةُ وَرَجُلٌ قَامَ إِلَى إِمَامٍ جَائِرٍ فَأَمَرَهُ وَنَهَاهُ، فَقَتَلَهُ}[1].

واتە: گەورەی شەهیدان حەمزەیە و پیاوێك لە حوکمکارێکی ستەمکار ڕاست دەبێتەوە، فەرمانی پێدەکا (بەچاکە)و نەهی لێدەکا (لەخراپە)، ئەویش دەیکوژێ، ئەوە لەگەڵ حەمزەدا وەك یەکە، یان: {أَفْضَلَ الْجِهَادِ كَلِمَةُ حَقٍّ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ}[2] واتە: باشترین جیهاد قسەیەکی هەقە لەلای حوکمڕانێکی ستەمکار.

مەبەستم ئەوەیە کە سەرگەرم بوون بە هەندێك شتی بچووکی سوننەتەوە، لەسەر حیسابی قورئان، مسوڵمانیەتییەکی کاریکاتێریی پێشان دەدات، دوایی کە خەڵك دەیبینێ، وادەزانێ مسوڵمانەتیی نموونەیی ئەوەیە، دەڵێن: فڵانکەس مسوڵمانێکی خۆپێ مومتازو دیندارێکی باشە، بەڵام ئاگای لەدنیا نیەو، هیچ هەقی بەسەر سیاسەت

---

(١) أخرجه الحاكم: ٤٨٨٤، وقال: صحيح الإسناد.

(٢) أخرجه أبو داود: ٤٣٤٤، وابن ماجه: ٤٠١١.

و خەڵكەوە نیە! بەڵام ئایا ئیسلام بۆ ئەوە هاتوە لەپەڕاوێزی ژیاندا بێ؟ بێگومان نەخێر.

دوو: زێدەڕۆیی كردن لە هەندێك جۆرە مامەڵە لەگەڵ قورئاندا، لەسەر حیسابی لێتێگەیشتن و كارپێكردنی:

بەدڵنیایی چاك قورئان خوێندن (تجوید) فەرزە، بەڵام تۆ هەموو ژیانی خۆت تەرخان بكەی بۆ چاك قوئان خوێندن، زۆرباشە ئەوە چاكت قورئان خوێند، ئەدی كەی تێیدەگەی؟ پاشان كەی چاكی ئیش پێدەكەی؟ هەروەها كەی چاكی جێبەجێ دەكەی و خەڵكی وڵاتی پێ چاك دەكەی؟! بۆیە دەبێ وریا بین! بەڵێ چاك قورئان خوێندن گرنگ وپێویستە، بەڵام بەئەندازەی خۆی، نەك لەسەر حیسابی لایەنەكانی دی.

سێ: گەورەكردنی قەبارەی سوننەت لەسەر حیسابی قورئان:

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: سوننەت دادوەرە بەسەر قورئاندا! كە ئەوە بۆچوونێكی زۆر غەڵەتە، بەڵكو جاری واهەیە بەوەشەوە نەوەستاون، بەڵكو زانایەك بەناوی (كەرخیی)[1] كە یەكێكە لەزانایانی حەنەفیی مەزهەب گوتوویەتی: هەر ئایەت و حەدیسێك لەگەڵ مەزهەبی ئەبووحەنیفەدا تێك نەكاتەوە، یان مەنسووخە یان دەبێ تەئویل بكرێ! واتە: هەر یەكجاریی وەحیی لێبگەڕێن و قسەی

---

(١) أبو الحسن عبيدالله بن الحسين.. الكرخي البغدادي الحنفي الفقيه، المتوفي: ٩٥٢م ـ ٣٤٠هـ

بەشەران بکرێتە بنەما بۆ دینداریی!! بێگومان ئەبوو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێبێ، زانایەکی گەورەو لێهاتوو بووە، بەڵام بۆچوونی وی بکرێتە جۆرە دینێك و، هی ئەوی دیکە جۆرە دینێك و...هتد، ئەدی ئەو دینەی خوا ناردوویەتی، کە لە قورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە، چی لێهات؟!

چـــوار: دەمارگیر بوون بۆ ئەهلی حـــەدیس (أهل الحديث) هەرچەندە شارەزاش نەبن:

هەندێك لەئەهلی حەدیس، شەرعزان (فقيه) نەبوون و لەئاییندا شارەزا نەبوون، بەڵام هەندێك کەس هەر لەبەرئەوەی زۆر خەریکی حەدیسان بووە، دەمارگیریی بۆ هەندێك بیروڕایان هەبووە، بەبێ بەڵگە بۆ وێنە: (شێخ ناصرالدين الألباني) فەرموودەناسێکی گەورە بووەو، من زۆر ڕێزم بۆی هەیە و، زۆریش ئیستیفادەمان لێیکردوە، بەڵام شەرعزانێکی پسپۆڕ نەبووەو هەندێك فەتوای داون، لەبواری جیاجیادا کە تێیان دا نەیپێکاوەو بەهەڵەداچووەو، خۆزگە بەس کارەکەی خۆی کە چاکی زانیوە، هەر ئەوەی کردبایە کە زانستی فەرموودەناسییە، فیقهیش بۆخۆی مەیدانێکی دیکەیەو، کەم وایە ئینسان بتوانێ لەهەموو مەیدانێکدا ئەسپی خۆی تاوبدات!!

پێنـــج: پشتگوێ خســـتنی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەبیانووی جۆراو جۆرەوە:

وەك:

أ- ئێمە چۆن دەبێ پشت بە سوننەت ببەستین، لەحاڵێك دا ئەو هەموو فەرموودە هەڵبەستراوانە هەن؟

ب- سوننەت درەنگ نوسراوەتەوە لە ساڵی (٩٩)ی کۆچیی دا بەفەرمیی دەستکراوە بە نووسینەوەی سوننەت!

ج- هەندێك دەق کە بە سوننەت دادەنرێن، لەگەڵ عەقڵ و زانست و قورئان دا تێك دەگیرێن!

لەوبارەوە دەڵێین:

یەکەم: ئەگەر لەبەرئەوەی لەنێو سوننەت دا دەقی هەڵبەستراو (الموضوعات) پاڵدراونە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) [دروست نیە بگوترێ: فەرموودەی هەڵبەستراو (موضوع) بۆ زانیارییتان! بەڵکو دەبێ بگوترێ: قسەی هەڵبەستراو، چونکە بێژەی فەرموودەی هەڵبەستراو (الحديث الموضوع)، دژیەکییە[1]، ئەگەر فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ، هەڵبەستراو نیەو، ئەگەر هەڵبەستراو بێ، فەرمایشت نیە] کۆی سوننەت ڕەدبکەینەوە، ستەمێکی گەورەیەو، وەك چۆن شتی ناڕاست خراوەتەگەڵ دەقەکانی سوننەت، کە بێگومان زانایان بۆیان لەبێژینگ داوین، بەهەمان شێوە لەنێو تەفسیرەکانیش دا قسەی بێ سەروبەر هەیە، بۆ وێنە: (الطبري) کە پێشەوای توێژەرەوانی قورئانە، لە تەفسیری ئایەتەکانی (البقرة) دا کە باسی طالووت و جالووت دەکەن، باسی (عوج بن عنق) دەکا، هەروەها ژمارەیەك لە تەفسیرەکان[2] لە بەسەرهاتی (داوود و سولەیمان)

---

(١) دژیەکیی: تناقض.

(٢) بۆ نموونە تەفسیری (التحرير والتنوير)ی ( محمد طاهر بن عاشور) کە لە تەفسیری سوورەتی (ص) دا بەرپەرچم داوەتەوە.

دا، باسی شتی عەجایب و ناڕاست دەكەن و، یەكسەر قسەكانی پەیمانی كۆن دێنن و لەوێ چی گوتراوە، نەقڵی دەكەن، بەبێ ساغكردنەوەو لێكۆڵینەوە.

كەواتە: ناگونجـــێ هەر لەبەرئـــەوەی هەندێك دەق بەناوی پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) گوتراون، بێنین، ئەوەش كە بەڕاستیی و ساغیی و لەگەڵ قورئان و سوننەت داو، لەگەڵ عەقڵیش و لەگەڵ واقیعیش دا دەگونجێ، هەر فڕێی بدەین، ئەوە شتێكی بێ جێیە.

دووەم: دواكەوتنی بەفەرمیی نووسینەوەی سوننەت (تأَخُّر تدوين السنّة الرّسمي) حیكمەتی گەورەی تێدایەو، ئەوە بووە كە لەگەڵ قورئان دا تێكەڵ نەبێ، بەڵام ئەوەش بەمانای ئەوە نیە كە سوننەت هەر نەنووسراوەتەوە، بەڵكو بەڕەسمیی نەنووسراوەتەوە، ئەگەرنا زۆر لە هاوەڵان نووسیویانەوتەوە لەلایان هەبووەو، بێگومان هەندێكیان لەبەركردنەكەیان وابووە، لە نووسینەوەكەیان مەحكەمتر بووە! یەكێك لەوانە (أبو هريرة) كە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دوعای بۆكردوەو دەڵێ: هەرشتێكم لە پێغەمبەر بیستوە، وەك خۆی لەبیرم بووەو هیچم لەیاد نەچووە!

سێیەم: هەندێك لەو دەقانەی كە پاڵ دەدرێنە لای سوننەت و، لەگەڵ عەقڵ دا تێكدەگیرێن، یان لەگەڵ قورئان دا تێكدەگیرێن، یان لەگەڵ واقیع و عیلم دا، وەك لەو كتێبەی خۆم: [پێناسەو پێویستیی و گرنگیی ڕێبازی پێغەمبەر (صلي الله عليه وسلم)] دا باسم كردوە،

پێشەوایان گوتوویانە: هەر دەقێك لەگەڵ عەقڵ، یان زانست، یان واقیع: یان قورئان دا تێك بگیرێ، بێگومان فەرمایشتی پێغەمبەر نیە.

(إبن تيمية) لە كتێبی (درء التعارض بين العقل والنقل)[١]دا گوتوویەتی: (فلا يُعلم حديث واحد على وَجْه الأرض يُخالفُ العقْلَ أو السَّمْعَ الصحيح، إلاّ وهو عند أهل العلم ضعيف بلْ موضوع) واتە: هەموو دونیا بگەڕێی یەك دەقی سوننەت نابینیەوە، دەقێكی ڕاست بێ و لەگەڵ قورئان یان لەگەڵ عەقڵ دا دژ بوەستێ، ئەگەر دژ بوەستێ، دیارە بێهێزە بگرە هەڵبەستراوە.

بەڵام جاری واش هەیە دەقێكی سوننەت، خەڵك باش لە مانایەكەی تێناگات و، لەئەنجامی خراپ حاڵیبوون و هەڵە تێگەیشتنەوە لێی دەكەوێتە گومانەوەو، لەوبارەوە دەبێ دووربینیی و وریایی زۆربكرێ و پەلە نەكرێ لە حوكم دان دا.

پوختەی مەبەست: خوشك وبرایانی بەڕێز! كاكڵەی قسەكانم ئەوەیە كە ئەگەر ئێمە بمانەوێ بزانین ئیسلام چییە؟ ئیسلام بەگشتیی بە هەموو بەشەكانیەوە، هیچ چارمان نییە دەبێ لە قورئان تێبگەین و، بەهۆی قورئانەوە دەزانین ئیسلام چییە؟ قورئان نێوەڕۆك و مەتنی ئیسلامەو، قورئان ئەو چاوگەیە كە ئیسلامی لێوە هەڵدەقوڵێ، بەڵام ئەگەر بشمانەوێ بزانین قورئان چۆن جێ بەجێ دەكرێ، لەلایەنە كردەییەكەیەوە؟ چارمان نیە دەبێ ڕێبازی پێغەمبەر (عليه الصلاة

---

(١) ج١، ص١٥٠.

والسلام) بگرین و، ئەگەر لە هەموو قورئان دا تەنیا ئەم ئایەتە هەبووایە، کە بە بەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ئەوەی لەسەر مسوڵمانان پێویستە بەدوای قورئان بکەون و، پێویستیشە ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بگرن، ئەگەر تەنیا ئەم ئایەتە هەبووایە بەس بوو، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ ...وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾الحشر.

واتە: هەرچی پێغەمبەر پێتان دەدا، لێی وەربگرن و، هەرچی ئەو لێتانی قەدەغەدەکات، لێی دووربکەونەوەو پارێز لەخوا بکەن، بێگومان سزای خوا توندە.

ئنجا ئایا شوێنکەوتنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: لەپێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەکی باش هەیە بۆ ئێوە، بۆهەرکەس بەئومێدی خواو ڕۆژی دوایی بێ و زۆریش یادی خوا بکات، یان کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران.

بڵێ: ئەگەر خواتان خۆش دەوێ شوێنم بکەون، خواش خۆشیدەوێن و لە گوناهەکانتان دەتانبوورێ و خواش لێبوردەی بەبەزەییە بەڵێ شوێن کەوتنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بەڵگەی خۆشویستنی مرۆڤە بۆ خواو، مەرجی خۆشویسترانیشیەتی لەلایەن خواوە، ئنجا

ئەگەر ئیسلام تەنیا لە قورئان دا بەرجەستەبووایە، خوا باسی پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) و شوێنکەوتنی و بەسەرمەشق گرتنی نەدەکرد، بەڵام بێگومان پێغەمبەری خوا قورئانێکی زیندوو بووەو، قورئانی لەخۆیدا بەرجەستە کردوە، پاشان پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام) جگە لەو وەحییەی کە لە قورئاندا بەرجەستەیە، وەحیی دیکەشی بۆهاتوە، ئەوە هیچ گومانی تێدانیە، وەك لە (سنن النسائي)[1] و (سنن ابن خزیمة) و (سنن الکبری) للبیهقي، دا هاتوە، کە جیبریل دووجاران دابەزیوە بۆ سەر زەوی، جارێك پێشنوێژیی بۆ پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) کردوە بۆ دیارییکردنی سەرەتای کاتی نوێژەکان و فەرموویەتی: کاتی نوێژی بەیانیی ئێستایە، دوایی نیوەڕۆ، ئنجا عەسر، ئنجا شێوان، ئنجا خەوتنان، هەروەها بۆجاری دووەم دیسان پێشنوێژیی بۆکردوە، بەڵام ئەوجارە لە کاتە کۆتاییەکان دا، چ کاتێك جائیزە؟ فەرموویەتی: ئەوە دواکاتی نوێژی بەیانییە، بەهەمان شێوە نوێژی نیوەڕۆو عەسرو شێوان و خەوتنان، دوایی فەرموویەتی: پێنج نوێژەکانی ئۆممەتەکەت لەنێوان ئەو دوو کاتەدان، ئەوە کاتی هەڵبژاردەیەو، ئەوەش کاتی دروست و ڕەوایە، نەك هەرئەوەندەش بەڵکو زۆرجار وەك لە صەحیحی بوخاریی و صەحیحی موسلیم و لەکتێبەکانی سیرەدا هاتوە، کە جیبریل دابەزیوە بۆلای پێغەمبەر (صلي الله علیە وسلم) فەرموویەتی: ئەو پرسیارەی لێیان لێکردی، ئەوە وەڵامەکەیەتی، بۆیە ئێمە بەبێ ڕێبازی پێغەمبەر (علیە الصلاة

---

(١) بە ژمارە: ٥١٢ وصححه الألباني في (صحیح النسائي: ٢٥٥/١) وابن خزیمة: (١٨٢/١)، والبیهقي في الکبری: (٣٦٨/١).

والسلام) لایەنە کردەییەکەی قوڕئان و لایەنە جێبەجێکردن (تطبیق) یەکەی ئیسلامیان بۆ ڕوون و دەستەبەر نابێ!

کۆتایی قسەکانیشم بەم کورتە وتووێژە دێنم:

بۆخۆشیی ئەمە دەگێڕمەوە: ماوەیەك لەمەوبەر یەکێک کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەو قسەو قسەلۆکانەوە، ئەوانەی ناویان لە خۆیان ناوە قوڕئانیی، گەنجێک بوو زۆر شارەزاش نەبوو، گوتم: باشە ئێمە چۆن نوێژێ بکەین؟

گوتی: نوێژ بەمانای (الدعاء) نیە؟

گوتم: با.

گوتی: ئێمەش دوعا دەکەین.

گوتم: هەر دوعاو بەس؟

گوتی: بەڵێ.

گوتم: ئەدی ئەو پێنج نوێژ فەڕزەی زانراون؟

گوتی: ئنجا ئەوە کێ دەڵێ: وایە؟ خوا فەرموویەتی: نوێژێ بکەن، نوێژیش یانی: دوعا و تەواو.

گوتم: ئاخر هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، نە یەک بووە، نە دوو بووە، سەد نەبووە، نە هەزار نەبووە، لە حەجی ماڵئاواییدا هەندێ دەڵێن: (١٢٠,٠٠٠) هاوەڵ لە خزمەت پێغەمبەردا حەجیان کردوە، لەنێو ئەو هەموو خەڵکەدا نوێژی کردوە.

گوتی: ئەوجار کێ دەڵێ: وایە؟

گوتم: ئەدی تۆ بڕوات بەچی هەیە؟

گوتی: من بڕوام بە سوننەت نییە.

گوتم: ئەدی بڕوات بەچی هەیە؟

گوتی: بە قورئان.

گوتم: دەی باشە، مادام باوەڕت بە قورئان هەیە، کێ قورئانی بۆ ئێمە نەقڵ کردوە؟

گوتی: قورئان خوا فەرموویەتی.

گوتم: ئاخر لە ڕێی کێوە پێمان گەیشتوە، لە ڕێی هاوەڵانەوە پێمان نەگەیشتوە؟

گوتی: با.

گوتم: چۆن بڕوات بەو سەد هەزار (١٠٠,٠٠٠) هاوەڵە کرد کە قورئانیان بە سەلامەتیی بۆ ئێمە نەقڵ کردوە، ئەدی بۆچی بڕوایان پێ ناکەی پێنج فەڕزەی نوێژیشیان کردوەو، زەکات و ڕۆژوو حەج و... هتد؟! ئیدی فەقیرە دامابوو تێگیرا.

گوتم: تۆ لەوێ دەڵێی: هاوەڵان ڕاست دەکەن، قورئانیان نەقڵ کردوە، بێ دەستکاریی، بەڵام بۆ پێنج فەڕزەی نوێژ ڕاست ناکەن، لە حاڵێکدا قورئانەکە هەر یەک قورئانە، بەڵام ڕۆژێ پێنج جاران نوێژیان کردوە؟!.

شتێکی زۆر بێجێیە تۆ لەلایەکەوە بڕوات بە هاوەڵان بێ، کە قورئانیان بۆتۆ نەقڵ کردوە، بەڵام لەوی دیکە بڕوات پێیان نەبێ، ئنجا گوتم: کاکە گیان! تۆ نازانی هەڵگرانی ئەو بیرۆکەیە پێشێ تانە لە سوننەت دەدەن، دوایی تانە لە قورئانیش دەدەن، تۆ باوەڕ بە هاوەڵان نەکەی، چواردە سەدەیە نوێژیان بۆتۆ نەقڵ کردوە!! قورئانیش هەروایە!، کە تانەت لەودا، لەویش دەدرێ.

ئنجا من ئامۆژگارییتان دەکەم، وریا بن! هەندێك لەوانە ڕەنگە خەڵکێکی سادە بن، هەشیانە ئەمڕۆ تانە لە سوننەت دەدا، سبەینێ لە قورئانیشی دەدا! بۆیە دەڵێم: نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو قبووڵ مەکەن بەگشتیی تانە بدرێ لەزانایان و لەفیقهی ئیسلامیش! بڵێن: فڵانکەس لە فڵان بابەتەی فیقهیدا بەهەڵەدا چووە، بەڵام فیقە و کەلەپوورو بەرهەمی تەصەووف و کتێبەکانی زانستی کەلام هەموویان ڕەت بکرێنەوە؟! ئەوە ڕاست نیە، بەرهەم و بۆچوونی زانایان ئایا پێکاویانە یان نەیان پێکاوە؟ بواری قسەو باسی زۆری تێدایە، بەڵام کۆی بەرهەم و کەلەپوورەکە، دەریایەکە پڕە لە گەوهەرو، ئێمە لێی بەهرەمەند دەبین، کەواتە: ئێمە نەك هەر لە سوننەت، دەبێ دیفاع لە کتێبەکانی دیکەش بکەین، کە زانایان بەرهەمیان هێناون بۆ لێتێگەیشتنی قورئان و سوننەت، چونکە ڕێیان بۆ ئاسان بۆتەوە، بەڵام دەست و پێی خۆمانی پێنەبەستین بەو کەلەپوور (تراث) و ئیجتیهاد و بۆچوونە، بەڵکو عەقڵی خۆشمان بکەینەوەو، لەوانیش بەهرەمەند بین و، بزانین ڕۆژگاری خۆشمان چی پێویستە لەقورئان و سوننەت هەڵیبهێنجین و دەری بهێنین.

خوا بەلوتف و كەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، هەموو لایەك زیاتر لە قورئان تێبگەین و، زیاتر بە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) و ڕێبازەكەی ئاشنا بین و، دینداریيەكی ساغترو ڕاستترو چاكتر بكەین.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلاّ أنت، أستغفرك وأتوب إليك

١٢ / ڕەبیعی یەكەم / ١٤٤٣ ك

١٨ / ١٠ / ٢٠٢١ ز

# کۆی بەرهەمە چاپکراوەکان

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| أ / کتێبە کوردییەکان | | | |
| قـورئـانو سـونـنـەت | | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیســلام لەبەر ڕۆشنایی سـورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤ چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١) سـووڕەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢) سـووڕەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٣) سـووڕەتی: (النسـاء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٤) سـووڕەتی: (الـمائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواروچاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٧ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٥) سـوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٦) سـوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٧) سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٨) سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٩) سـوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٠) سـوورەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١١) سـوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١٤ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٢) سـوورەتەكانی: (الرعد، إبراهيم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٥ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٣) سوورەتی: (النحل) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٦ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٤) سوورەتی: (الإسراء) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواروچـاپ | تێبـیـنـی |
|---|---|---|---|
| ١٧ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی: (١٥) سووڕەتەكانی: (الكهف) و (مریم) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٨ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی: (١٦) سووڕەتەكانی: (طه) و (الأنبیاء) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ١٩ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی: (١٧) سووڕەتەكانی: (الحج) و (المؤمنون) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٠ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی: (١٨) سووڕەتەكانی: (النور) و (الفرقان) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢١ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی: (١٩) سووڕەتەكانی: (الشعراء) و (النمل) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٢ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی: (٢٠) سووڕەتەكانی: (القصص) و (العنكبوت) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٣ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی: (٢١) سووڕەتەكانی: (الروم) و (لقمان)و (السجدة) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواروچاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٢) سوورەتەكانی: (الاحزاب) و (سبأ) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٣) سوورەتەكانی: (فاطر) و (یس)و (الصّافات) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٦ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی‌و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٦ چاپی دوو/٢٠١٨ | |
| ٢٧ | قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەرەدا | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٨ | قورئان‌و سوننەت وەك ڕووح‌و جەستە تێكهەڵكێشن | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | بیروبڕواو فیكری ئیسلامیی | | |
| ٢٩ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچكان | چاپی یەك/١٩٨٥ چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ٣٠ | ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم كامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو كتێبی (مسوڵمانی كامڵ: بەشی یەكەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |

| تێبینی | بەرواری چاپ | کتێبەکان | ژ |
|---|---|---|---|
| دواتر خرایە نێو کتێبی: (پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی) | چاپی یەك/١٩٩٥ | پڕۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامییانە | ٣١ |
| | چاپی یەك/١٩٩٦ | پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | ٣٢ |
| وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی چوار/٢٠١٤ | بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | ٣٣ |
| وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیو تورکییو فارسییش | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی شەش/٢٠١٦ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | ٣٤ |
| | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی سێ/٢٠٢٠ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلامو پووچەڵیی ئیلحاد) | ٣٥ |
| | چاپی یەك /٢٠١٣ | ناوە هەرەجوانەکانی خوا «سبحانە وتعالی» | ٣٦ |

| ژ | کتێبەکان | بەرواروچاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | مەوسووعەی : ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٣٧ | بەرگی یەکەم: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٣٨ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٣٩ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت‌و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٤٠ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٤١ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی‌و قەزاو قەدەر | | |
| ٤٢ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی‌و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٤٣ | مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤٤ | تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقـە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە) دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٤٥ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢ چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٤٦ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طـە حاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٤٧ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طە حـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٤٨ | سیکۆلاریزم‌و دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی‌و، شێوەزاری کرمانجیی |
| ٤٩ | درەوشاوەیی ئیمان‌و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماك‌و عەقڵ‌و زانست‌و وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢٠ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٥٠ | مەوسووعەی: بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی‌و واقیعدا | | |
| ٥١ | كتێبی یەكەم: پێناسەو چییەتو سەر گوزشتەو سەرچاوەكانو گرنگیی: بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٥٢ | كتێبی دووەم: هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٥٣ | كتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٥٤ | كتێبی چوارەم: پایەكانی بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ٥٥ | كتێبی پێنجەم: چەند پرسێكی فیكریی هەنووكەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| | زنجیرەی: باچاكتر ئیسلام بناسین! | ئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە | |
| ٥٦ | ئاڵقەی یەكەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٧ | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران «علیهم الصلاة والسلام» | چاپی یەك/١٩٨٩<br>چاپی دوو/١٩٩٠ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٥٨ | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٩ | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | دوایی خرایە نێو كتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) | |
| ٦٠ | بیرو باوەڕ | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن‌و پێگەیشتن، كە لە: (١٢) كتێب پێكهاتوە | | | |
| ٦١ | بەرگی یەكەم: واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆكارو چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠ چاپی دوو/٢٠٢١ | |
| ٦٢ | بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێكی كاری ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢١ | |
| ٦٣ | بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی كۆمەڵگاو پاكسازیی‌و چاكسازیی تێداكردنی | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٤ | بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێكی ڕاست‌و ڕەسەن | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢١ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٦٥ | بەرگی پێنجەم: پایەكانی بووناسیی‌و، ڕوونكردنەوەی ئیمان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٦ | بەرگی شەشەم: خواپەرستیی، تەزكیە، تەقوا | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٧ | بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٨ | بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانیی‌و فیكرییەكانی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٩ | بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەكیی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٧٠ | بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسیی گرنگ‌و هەستیار | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٧١ | بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەكانی تەبایی‌و یەكڕیزیی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٧٢ | بەرگی دوازدەیەم: بنەڕەتەكانی مسوڵمانەتییەكی ڕاست‌و هاوسەنگ | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | فیقهـی ئیسـلامیی | | |
| | مەوسـووعەی: خواپەرستیی ئیسـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠ چاپی دوو/٢٠٠٩ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧٣ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاكو خاوێنیی | | |
| ٧٤ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| ٧٥ | بەرگی سێیەم: زەكاتو ماڵ بەخشین | | |
| ٧٦ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەجو عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| ٧٧ | بنچینە گرنگەكانی هەڵسوكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٧٨ | جەژن و یادو بۆنەكانو هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٧٩ | سروودو مۆسیقاو چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە كراوە |
| ٨٠ | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵو سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | تەزكیەی نەفس و ڕەوشت و ئاكار | | |
| ٨١ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |

| تێبینی | بەرواری چاپ | کتێبەکان | ژ |
|---|---|---|---|
| وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیو فارسییش | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی شەش/٢٠٢١ | ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، تەزكیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | ٨٢ |
| | چاپی یەك/١٩٩٨ | تەزكیەو تەبایی‌و، یەكڕیزیی‌و برایی | ٨٣ |
| | چاپی یەك/١٩٩٩ | مزگەوتەكانی كوردستان لەنێوان ئاوەدانكردنەوەو وێرانكردندا | ٨٤ |
| | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی شەش/٢٠٢١ | گەڕانەوە بۆ لای خـوا (سبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان‌و، وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی‌و، گۆڕانكاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | ٨٥ |
| | چاپی یەك/٢٠٠٢ | شەهید كێیەو چ پلەوپایەیەكی هەیە !؟ | ٨٦ |
| | چاپی یەك/٢٠١٥ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دواڕۆژدا | ٨٧ |
| | چاپی یەك/٢٠١٥ | گیانی ژیـان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن | ٨٨ |
| | چاپی یەك/٢٠١٦ | مەوسووعەی: ڕەوشت‌و ئاكاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | ٨٩ |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٩٠ | ئەدەبو ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر ڕۆشنایی وەحییو عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | بانگەوازو کاری ئیسلامی | | |
| ٩١ | کۆمەڵی خـــوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٩٢ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسولمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨ چاپی چوار/٢٠٢٠ | |
| ٩٣ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٩٤ | بزووتنەوەی ئیسلامییو قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٩٥ | بزووتنەوەی ئیسلامی لە دووڕیانی مانو نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٥ | |
| ٩٦ | هەڵسەنگاندنو هەڵوێستمان لەم قۆناغەدا | چاپی یەك/١٩٩٥ | |
| ٩٧ | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٩٨ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەكانی كوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٩٩ | بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و ئاسۆیەكی گەش‌و ڕوون، بنەما شەرعییەكان و بنچینە ئەخلاقییەكان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| ١٠٠ | ئیسلام‌و كێشە هەنووكەییەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ١٠١ | زانایانی ئیسلام كێن‌و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ١٠٢ | كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج‌و هەڵوێستەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ١٠٣ | هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی داو، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ١٠٤ | چۆن لە جیهاد تێبگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروارو چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٠٥ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ١٠٦ | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەینو لەسەر جەنگ كردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ١٠٧ | جیهاد لە ڕێی خوادا چییەو بۆچی دەكرێو چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ١٠٨ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشكو برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ١٠٩ | ئیسلامو مسوڵمانەتیيو كاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ١١٠ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١١ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩ چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە: ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان. ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ١١٢ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥ چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ١١٣ | با لادانو تاوانی پەرگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٤ | پەڕگیـریی: پێناسـەی، نیشانەکانی پەڕگیـران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شـوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چـارەسـەری | چـاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ١١٥ | هەڵوەشاندنەوەی پەڕگیریی | چـاپی دوو/ ٢٠١٨ | کۆی سێ نامیلکەی پێشووە |
| ١١٦ | بەرەو بانگەوازێکی ڕاستو ڕەسەن | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن |
| ١١٧ | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ چاپی دوو/٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن |
| ١١٨ | کێ شایستەی مینبەرو میحرابە؟ | چـاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| بنەمـا شەرعییەکانی کارو چالاکیی ڕێکخراوەیی و حیزبیی | | | |
| ١١٩ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٢٠ | ئاڵقەی دووەم‌و سێیەم: حوكمی لادانی خەلیفەو كاربەدەستانی مسولْمان لەكاتی لاریی و ستەمكارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ١٢١ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبوو بەصیرو هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەكەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| ١٢٢ | چۆن گەشە بە كۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟ | چاپی یەك / ٢٠٢٠ | |
| | وتاری كۆنگرەكانی كۆمەڵی دادگەریی كوردستان | | |
| ١٢٣ | كارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری كۆنگرەی یەكەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥ چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٢٤ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیكریی، سیاسیی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان (وتاری كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ١٢٥ | چاوپێداگێڕانەوەیەكی بارودۆخی نێوخۆمان‌و واقیعی دەرەكییمان (وتاری كۆنگرەی سێیەمی كۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٢٦ | وتاری فیكریی‌و سیاسیی كۆمەڵی دادگەریی كوردستان/ ٢٠٢١/٢/١٨ | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی كورد | | |
| ١٢٧ | كوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٢٨ | مەسەلەی كورد چیەو چۆن‌و بەچی چارەسەر دەكرێ؟ | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٢٩ | حوكمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ١٣٠ | سۆزی نەتەوایەتیی‌و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی چوار/٢٠١٨ | وەرگێرردراوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ١٣١ | چارەسەری كێشەی كورد لە نێوان ئیمان‌و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| ١٣٢ | چەند ڕێنموویيەك بۆ حاڵەتی ئیسلامیی لە كوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٣٣ | جەژنی قوربان‌و جەنگی قەڵاتووكان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواروو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | سیاسەت و حوكمڕانیی | | |
| ١٣٤ | چەند بابەتێكی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلامو دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤ | |
| ١٣٥ | بەرگی یەكەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەكانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشتو بناغەی فیكریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ١٣٦ | بەرگی دووەم: بنەمایەكانی سیستمی حوكمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ١٣٧ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەكان): یاسادانان جێبەجێكردن دادوەریی | | |
| ١٣٨ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ١٣٩ | ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ١٤٠ | قورئانو پاكسازیی‌و چاكسازیی لە هەرێمی كوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٤١ | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/ ٢٠١٩ چاپی سێ/٢٠٢١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێبـینـی |
|---|---|---|---|
| ١٤٢ | واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆكارو چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠ چاپی دوو/٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن |
| ١٤٣ | سەركردایەتیی كردن لەئیسلامدا چیەو چۆنە؟! | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | ئافرەت و خێزان | | |
| ١٤٤ | ئافرەتی مسـوڵمانی كورد، مافە شەرعییەكانیو ئەركە گرنگەكانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ چاپی دوو/ ٢٠٠٣ | |
| ١٤٥ | مەوسـووعەی : ئـافرەتو خێزان لە سـایەی شــەریعـەتدا | بەرگی یەكەم چاپی یەك/٢٠٠٢ بەرگی یەكو دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | مـێـــژوو | | |
| ١٤٦ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەرسو پەندەكانی | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ١٤٧ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەكانم)، بەشی یەكەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٤٨ | بەرکوڵێکی کاروچالاکییو ڕووداوەکانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبییو ئینگلیزیی وەرگێڕدراوە |
| | دیدارو گفتوگۆ | | |
| ١٤٩ | سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ١٥٠ | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیستو دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥ چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپو بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوە |
| ١٥١ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك ٢٠١٠/ | |
| ١٥٢ | گفتوگۆیەك لەگەڵ بابمدا | چاپی یەك ٢٠٢١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان | | |
| ١٥٣ | گەنجەکانـمان لە نێوان ڕەسـەنایەتیی و لاســـایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٥٤ | با وریا بیـن ! داڕووخـانی ڕەوشــت کۆمەڵگاکـــەمان بەرەو هەڵدێر دەبــات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢ چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٥٥ | بەدوورخســـتنەوەی ئافرەت لە ئیســـلام چ زیانێــك دەکــەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٦ | چۆنیەتی بوونە پێشـەنگو بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٧ | ســیاســەتی ئیســلامیی و چەند ڕوونکــردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٨ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٥٩ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سـەرنج و ڕێنماییەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٦٠ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسـند سـەنگی مەحەکی مسـوڵمانەتیيە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواروچاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٦١ | بانگەواز بۆ لای خودا چییەو چۆنەو بەکێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٦٢ | قوتابیان لەم هەلو مەرجەدا، پێویسـتە چۆن بنو چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٦٣ | واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسـلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٦٤ | سـروشتو پایەکانی خێزانو مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرعو عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١٦٥ | کاری ئیسـلامیو ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٦٦ | حوکمی لە ئیسـلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسـەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٦٧ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەیو چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٦٨ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی: هەبوونو نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٦٩ | تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چییەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣ چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٧٠ | ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك ٢٠١٢ / | |
| ١٧١ | خاتوون مەلاژن: ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسەرێكی ناوازە (١٩) | چاپی یەك ٢٠١٢ / | |
| ١٧٢ | گەنجو قەیرانی ڕووحیی: هۆكار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٧٣ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەكان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| ب/كتێبە عەرەبییەكان | | | |
| | موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | سەرجەم بەرگەكان كاركردن تێیدا بەردەوامە بۆ تەرجەمەكردنی بۆ سەر هەردوو زمانی توركیی و فارسیی |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | كە لە چاپی یەكەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | |
| ١٧٤ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | بۆ هەردوو زمانی توركییو فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٧٥ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی توركییو فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٧٦ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی توركییو فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٧٧ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی توركییو فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٧٨ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٧٩ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٨٠ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |

| تێبینی | بەرواری چاپ | کتێبەکان | ژ |
| --- | --- | --- | --- |
| | ط الثانية/٢٠١٨ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ١٨١ |
| | ط الثانية/٢٠١٨ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ١٨٢ |
| | ط الثانية/٢٠١٩ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ١٨٣ |
| | ط الثانية/٢٠٢٠ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ١٨٤ |
| | ط الثانية/٢٠٢٠ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | ١٨٥ |
| ترجم إلى اللغات: الفارسية والإنجليزية والتركية | ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | نقض فكرة التطرف | ١٨٦ |

| ژ | کتێبەکان | بەرواروچاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٨٧ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٨٨ | لقاء خاص (مقابلـة مع قنـاة العـالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٨٩ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى /٢٠١٦ | |
| ١٩٠ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| ١٩١ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩<br>ط الثاني/٢٠١٣ | |
| ١٩٢ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٩٣ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| ١٩٤ | علماء الإسلام: أوصافهم النَّبيلة، وظائفهم الثقيلة، مواقفهم الجليلة | ط الاولى/ ٢٠٠٥<br>ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| ١٩٥ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١<br>ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| ١٩٦ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٩٧ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى والثانية/٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٩٨ | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى ٢٠١٧/ | |
| ١٩٩ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى ٢٠١٨/ | |
| ٢٠٠ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأُمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى ٢٠١٨/ | |
| | ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن | | |
| ٢٠١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/: تاکو سووڕەتی: (الناس) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ تاکو هەمووی چاپ دەکرێ | | |
| ٢٠٢ | گەنج و هەست و هەڵوێست | | |

# نێوەڕۆك

www.alibapir.com

# قورئان و سوننەت وەك
# ڕووح و جەستە تێكهەڵكێشن

ئەم كتێبە

لەبارەی پەیوەندیی نێوان قورئانو سوننەتەوە دەدوێ، تێیدا ڕوونكراوەتەوە كە قورئان (فەرمایشتی خوا)و سوننەت (ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوا) پەیوەندییەكی تێكهەڵكێشی وەك هی ڕووحو جەستەیان پێكەوە هەیە، ئاماژەش كراوە بە هەندێك بیروڕاو هەڵوێستی كرچو كاڵ، كە بەهۆیانەوە پەیوەندیی هاوسەنگانەی نێوانیان شوێنراوەو، هەوڵیش دراوە ئەو هاوسەنگییە بگێڕدرێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی، هەروەها كۆمەڵێك ڕاستیی دیكەی گرنگ لەبارەی قورئان و ڕێبازی پێغەمبەری خواوە "صلی الله علیه وسلم" خراونەڕوو.

 www.alibapir.net

 /alibapir1

 /alibapir




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوكردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

 /TafseerOffice

نرخی 2.000 دینار


9 789922 654843